رۆمان

قدسی نەسیری

# بێ سەرپەرشتان



وەرگێرانی لە فارسیەوە
حسێن نەجمەدین

بڵاوکراوەی خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا

زنجیرەی ٨٦

ناونیشان/سلێمانی–سەرەتای شەقامی مەولەوی– بەرامبەر پالاس

مۆبایل ئاسیا ٠٧٧٠١٥٧٥٠٦٧ – سانا ٠٧٥٠١١٢٨٣٨٨

نرخی ( ٥٠٠٠ ) دینارە

# بێسەرپەرشتان

قودسی نەصیری

# رۆمان

وەرگێڕانی: حسەین نەجمەدین

چاپی شەشەم ١

**پێناسی کتێب**

ناوی کتێب: بێسەرپەرشتان

بابەت : رۆمان

نوسینی: قودسی نەصیری

وەرگێڕانی : حسەین نەجمەدین

نۆبەتی چاپ : چاپی شەشەم

شوێنی چاپ : چاپەمەنی هێمن

تیراژ : ١٠٠٠ دانە

نرخ: ٣٠٠٠ دینار

ژمارەی سپاردنی (٩٤٢ ) سالّی ( ٢٠٠٦) ی پێدراوە

# پیشەکی

مەرج نییە هەرکەس لەپشت میلەکانی زیندانەوەبێ، ئیتر بەتەواوی مانا دڕندەبێ، نازانم بۆچی ،یاساناسان هەرگیز بیریان لەوە نەکردۆتەوە، یان باشترە بڵێم خۆیانی لێ گێل دەکەن. چونکە کاتێ تاوانبارێك دێتە بەردەستیان، ئیدی بێ گوێدانە باری کۆمەڵایەتی تاوانبار، یان هۆکاری پاڵنەری تاوان، یارەچاوکردنی ئاستی ڕۆشنبیری تاوانبار، بەپێی نوسراوی بەردەستیان بڕیاردەدەن وتاوانبار ئەتەپێننە ناوزیندان. بێ گوێدانە ئەوەی بزانن ئەوکەسە لەناو زینداندا تێکەڵی چ جۆرە مرۆڤێك دەبێت و یا چ جۆرە خو و ڕەوشتێك دەگرێ یان لەنێو زینداندا چی فێر دەکرێ. بۆیە دەڵێم فێرکردن چونکە وادەزانن زیندان دەبێتە قوتابخانەیەك و تاوانبار والێ دەکات واز لەتاوان بهێنێت. نازانن کۆکردنەوەی چەند تاوانبارێك لەژورێك دا دەبێتە هۆی ئەوەی هەرکەس لەدوای ئازاد بوونی بیر لەچەندین تاوانی جۆربەجۆر بکاتەوە ئەمە لەزیندانەکانی ئێمەدا وایە، نازانم لەوڵاتە پێش کەوتووەکان بەچ جۆرێك بەڕێوە دەچێت.

کاتێ ڕۆمانی (بێسەر پەرشتان) دەخوێنینەوە ئاشنادەبین بەپاڵەوانی چیرۆکەکە دەبینین بێژەن نەك هەرکەسێکی تاوانبار نەبوو،

بەڵکو لەدڵەوە زۆر هەوڵی دەدا ببێتە کەسێك بتوانێ خزمەتی کۆمەڵەکەی بکات. ئەمە جگەلەبەسەر بردنی تەمەن وڕاکردن لەدەست زوڵم وزۆری باوەژن ڕێکەوت وای کرد، بێژەن ببێتە کەسێکی تاوانبارو سزای تاوانێك بدات کەبەهیچ جۆرێ ئارەزوی کردنی نەبوو.

ڕەوڕەوەی ژیانی بێژەن ئەوە دەسەلمێنێ مرۆڤ چەند لەناو سەختی وئازارەکانی ژیاندا بژی وبەرەو ڕوی ناهەمواریەکانی ببێتەوە، گەر مرۆڤێکی کۆڵنەدەرو خاوەن ئیرادەیەکی پۆڵاین بێت لەگەڵ ئەم هەموو ئازارەشدا ئەتوانێ ململانێ بکات وبکاتە ئامانجی خۆی.

هەمیشە دەوترێ (ئومێد دەکەم بەم کارەم توانیبێتم کەلێنێکم لەکتێبخانەی کوردی پڕکردبێتەوە). من خۆم لەم قسەباوە بەدووردەگرم و دەڵێم: ( ئومێد دەکەم بەم کارەم توانیبێتم کەف وکوڵی دەرونی خۆمم دامرکاندبێتەوە).

وەرگێڕی کوردی

## بەندی یەکەم

روی پەنجـەرەی ژوورەکـەم لەسـەر شـەقامەکە بـوو، کاتێـک پەنجەرەکـەم دەکـردەوە بەئاسـانی دەمتـوانی سـەیری دەرەوە بکـەم، لـەکاتی خۆرەتـاودا درەختـی بـەر پەنجەرەکـەم سێبەری بۆ ژوورەکـە دروست دەکـرد و شـەوانیش گڵۆپـەکانی سـەر شـەقامەکە ژورەکـەمی روناك دەکردەوە، هەندێك جار دەنگی ئەسپ و عەرەبانە و دەنگە دەنگی سەر شـەقامەکە منـی بێدار ئەکردەوە. کۆشـکی گـەورەو بڵـند بەرامبـەر پەنجەرەکـەم بـوون، سـەیری ئـەو دوکـان و پێـشانگایانەم دەکـرد لەشوشەکانیەوە کە جۆرەها ئامێری یاری کـردن و بوکەڵـەیان تێدا بوو، زۆر حەزم لێ دەکردن، هیچ کاتێك لە سەیرکردنیان تێرم نەدەخوارد.

کاتێك منداڵانی هاوتەمەنی خۆمم دەبینـی لەسـەر شۆستەکە یاریـان دەکرد دڵم تەپە تەپی شادی و خۆشی دەکرد، و حەزم دەکـرد، تـەنها بۆ سـاتێکیش بێـت لەگـەڵیان یـاری بکـەم، دەنگـی هـاوار و پێکـەنینیانم دەناسی، چونکە جیهانی ئەوانم بـە جیهـانێکی تـر دەزانـی، جیهانێك بۆ ئـەوان پڕلـە خۆشـی و شـادی بەڵام بۆ مـن هـیچ، هەمیشە لەبـەر ئـەوەی نەمدەزانی ڕێگای جیهانی ئەوان بدۆزمەوە خەفەتم دەخوارد،

کاتێك داپیرەم دەیبینـی سـەیری شـەقامەکە دەکـەم دەسـتە چرچ و لۆچە بێ تواناکانی بەرەو رووم درێژ دەکرد و هاواری دەکرد:

دیسانەوە چویتەوە لای پەنجەرەکە منیش بـە بیستنی دەنگـی ئـەو دەگەڕامەوە دواوە، هەر ئەوساتانەش نیگای پڕقین و توڕەیی ئەو منی

دەترساند و بەنائومێدیەکەوە دوور دەکەوتمەوە، من دایە گەورەم بەو هەموو تورەیی و خراپیانەشیەوە هەر خۆش دەویست.

نازانم چ شتێك لەدەرونم دابوو وای لێدەکردم خۆشم بوێت؟ هەرچەندە ژنێکی تورە بوو بەلام دلێکی گەورە وەك دەریا و گیانێکی گەورەی هەبوو، هەندێ جار ئەوەندە بەخۆشی باسی دۆستایەتی مرۆڤەکانی دەکرد من لەو تەمەنە مندالیەم دا هەستم دەکرد ئەو کەسانەی لێمەوە دوور و نزیکن پێویستە هەموویانم خۆش بوێت.

هەرچەندە لە روخساریدا ووزە و ووره و زیندەگی بەدی نەدەکرا و نیگای تارو لێل بوو بەلام لەگەل ئەو هەموو لاوازی یەیدا جۆرێك باسی ئایندەی دەکرد وا هەستت دەکرد لەسەرەتایی لاوێتیدایە و هەرگیز نامرێت، جێگەی سەرسامی من هەر ئەو ئومێدە گەورەیەی ئەو بوو.

ئێستا سالەهایە بەسەر ئەو ماوەیەدا تێ دەپەرێت تازە تێدەگەم ئومێد چ نەخشێکی گەورەی لەژیاندا هەیە و مرۆڤی بێ ئومێد مردووە، ئێستا هەندێ جار لەناخۆشیدا خەیالم ئافەرینی دەکات و دەلێم هەرچەندە جێ ی هێشتوم بەلام هەرگیز ناتوانم فەرامۆشی بکەم.

من هیچ کات دایکم نەدیوە و ئەگەر بینیبێتیشم هیچیم بیرناکەوێتەوە چون دووسالانە بووم مردبوو، لەو خەیالانەدابووم کتوپڕ باوکم خۆی کرد بە کتێبخانەکەدا و پاشان لەسەر کورسیەکەی بەرامبەرم دانیشت و بەئارامی پرسی سەرگەرمی خوێندنەوەی چ کتێبێکی و منیش بەئارامی کتێبەکەم دایە دەستی، کاتێك چاوی بەبەرگەکەی کەوت زۆر بە ئارامی وتی مندالی هەتیو نەخوێنیتەوە (بێژەن)، کورم ئیتر پێویست ناکات ئەم جۆرە کتێبانە بخوێنیتەوە چونکە بەم زوانە دەبیتە خاوەن دایکێکی دلسۆز و میهرەبان.

بەئارامی وتم : باوکەگیان هەرگیز مەڵێ دایکێکی دڵسۆز چونکە ئەو کەسەی تۆ ناوی دەبەیت باوەژنە و ئەو دوانەش زۆر لەیەکتر جیاوازن.

باوکم تا ئەوکاتەش زۆر دڵخۆش بوو چاو و برۆی ئاڵۆزاند و لەسەر کورسیەکە هەستایە سەر پێ و بەخێرایی چوو بۆ لایەکی تری کتێبخانەکە و دەستی کرد بە گەڕان بەدوای ئەو کتێبەی مەبەستی بوو، لەکاتێك دا پشتی کردبووە من و سەرگەرمی گەڕان بوو بەدوای کتێبەکان دا وتی:

بێژەن گیان باوەژنیش مرۆڤە وەکو هەموو مرۆڤەکانی تر خاوەنی دڵ و رۆحە و لەوکاتە دا ئەو کتێبەی مەبەستی بوو دۆزییەوە و بەهێواشی دەرگای کتێبخانەکەی کردەوە و سەیرێکی وێنەکەی دایکمی کرد کەلەسەر تاقێکی کتێبخانەکە دانرابوو وتی: بێژەن ئەزانم تۆ کوڕێکی زۆر ژیریت و زۆر قوڵ بیر دەکەیتەوە واچاکتر نیە بیرو باوەڕت دەربارەی ئەو بابەتە بگۆڕیت و پاش ووتنی ئەم قسانە زۆر بەخێرایی بەجێی هێشتم، ئەوەندە بە توند دەڕۆشتە خوارەوە گوێم لەدەنگی پێی بوو دەیکێشا بە پلەی قادرمەکاندا.

تا ئەوکاتەی لەبیرم مابێت باوکم پیاوێکی زۆر تورەبوو، کاتێك هەر شتێکی بەدڵ نەبوایە هیچ هێزێك نەیدەتوانی ململانێی لەگەڵ بکات، من و باوکم بەزۆری کاتی خۆمانمان لەکتێبخانەدا بەسەر دەبرد.

ماڵەکەی ئێمە چوارقاتێك بوو وە کتێبخانەکە لەنهۆمی سێیەمدا بوو، لە کتێبخانەکەماندا بەزۆری کتێبی زانستی و مێژویی بەدی دەکرا و کتێبی چیرۆك و داستانی کەمتر تیا بەدی دەکرا، باوکم حەزی لەنوسینەکانی مەکسیم گۆرگی و ئەرنست همینگوی و پوشکین بوو، بەڵام من حەزم لە نوسینەکانی ڤیکتۆر هۆگۆ و ئەلەکساندر دۆما بوو،

ئەو ماڵەی ئێمە تێیدا دەژیاین ماڵێکی دوور دەست بوو کەوتبوە نێوان دوو ڕیز درختی بڵند و سنەوبەری سەر سەوزەوە و جۆگەیەك ئاوی بچوکیش لەبەرامبەر ماڵەکەماندا تێدەپەڕی، لەقەراغ حەوشەکەماندا چەندین باخچەی بچوك و گەورە بەدی دەکرا، لەناوەڕاستی باخچەکانیشدا درەختی گێلاس و هەڵوژەیان چاندبوو، کاتێك وەرزی بەهار دەهاتە پێش ماڵەکەمان پڕ دەبوو لە گوڵی ئەو درەختانە.

باڵندە کۆچەرەکانیش لەشوێنی دوورەوە رویان دەکردە شارەکەمان لەسەر ئەو درەختانە کە هێشتا لە باخچەیەکی ساوادەچوون سەرگەرمی یاری کردن دەبوون. تەنها سەگە زیرەکەکەی من پەروەردەکراو بوو باوکم لەماڵێکی ئینگلیزی کڕیبوی و ناوی نابوو جیمی.

لەڕاستیدا لەبیریشم چوو ناوی پیرەژنێك بڵێم کەلەماڵی ئێمەدا دەژیا و دایەنی من بوو وەکارەکانی ماڵەوەی جێ بەجێ دەکرد. من ئەو ژنەم زۆر خۆش دەویست چونکە ئەو منی گەورە کرد ئەتوانم بڵێم لەجێگەی دایکم بوو. ئەویش لەم چەند رۆژەدا کە باوکم بەنیازە ژنی تازە بهێنێ لەماڵەوە سەرقاڵی کاروباری ماڵەوە بوو وە خۆی ئامادە دەکرد بۆ پێشوازی لە میوانەکانی ئەو ئاهەنگە.

هەفتەیەك تێپەڕی و رۆژی یەك شەممە بوو باوکم بەیانی زوو هاتە ژوورەکەم و وتی: بێژەن هەر ئەمڕۆ مریەم دێتە ئەم ماڵە ئەو ژنێکی زۆر میهرەبانە، بێگومان تۆی زۆر خۆش دەوێ، وا بیرمەکەرەوە بەهاتنی ئەو من تۆ لەبیر بکەم تۆ کوڕە تاقانەکەی منی و هیچ هێزێك ناتوانێ خۆشەویستی تۆ لەدڵم دەربکات و بەپەلە لەماڵ چوە دەر.

ئەو رۆژە ئاسمان خۆرەتاو بوو بەڵام ووشکە بایەکی دەهات، چووم بۆ قوتابخانە و نیوەڕۆ کە گەڕامەوە بۆ ماڵەوە بە ئارامی دەستم نا بە

زەنگەکە دا نەمدەزانی بۆچی دەستەکانم دەلەرزین، دەستم توند نا بە زەنگەکە دا چەند ساتێك تێپەڕی بەڵام هیچ کەس دەرگاکەی نەکردەوە، دڵم تەپە تەپی دەکرد، دووبارە دەستم نا بە زەنگەکە دا پاش چەند خولەکێك دەرگاکە کرایەوە و ژنێکی زۆر جوان و شیك پۆش لەبەرامبەر دەرگاکەدا دەرکەوت.

بەبینینی من زەردەخەنەیەکی کرد و خێرا خۆی لادا لەبەرامبەرم و منیش بەبێ ماتڵ بوون هاتمە ژوورەوە. لەوساتەدا هەستم کرد ماڵەکەمان گۆڕانکاری زۆری کردوە و ژمارەیەك ژن و پیاو، کوڕ و کچ، بچوك و گەورە کە تا ئەمڕۆ هیچیانم نەبینی بوو وە نەم دەناسین لەژوورەکاندا پێکەوە دانیشتبوون و قسەیان دەکرد.

ئەندازەیەکی زۆر کورسی و تەپڵەك لە حەوشەکەدا ریز کرابوون و لەسەر هەر تەپڵەکێك دا گوڵدانێکی پڕ لە گوڵی سوری مێخەك دانرابوو لەنێوان مێزەکانیش دا چەندین دەوری گەورە و بچوکی پڕ لە میوە و شیرینی دانرابوون.

من راستەوخۆ چووم بۆ کتێبخانەکە و بەسەرسامیەوە بینیم بارودۆخی کتێبخانەکەش گۆڕاوە و کتێبەکان هەریەکەیان بەلایەك دا فڕێ دراون و ژمارەیەکیشیان دڕابوون ، بەدیوارەکانیش دا وێنەی جۆراو جۆر هەڵواسرابوو هەر ئەوساتە شکم برد رەنگە ئەم وێنانە وێنەی باوەژنەکەم بن.

لە نهۆمی خوارەوەدا دەنگی شادی و پێکەنین دەهات. تا کاتی عەسر هەر لە کتێبخانەکە دانیشتم، وەلێ دەمەو ئێوارە بوو دایەنەکەم هاتە ژوورەکەم و بەئارامی وتی:

بێژەن بۆچی لێرە دانیشتوی وەرە بابچین بۆلای میوانەکان لەوانەیە باوکت لەم رەفتارانەت بێزاربێت و تووڕە ببێت تۆ مەگەر باوکی خۆت ناناسیت؟

یەکسەر بەگوێی دایەنەکەم کردوو چوومە نهۆمی خوارەوە لە هۆڵەکەدا چاوم بە ژنێکی جوان کەوت بەرگێکی شینی درێژی لەبەردابوو مۆمدانێکی زیوی بەدەستەوە بوو لەدوای ئەویشەوە کچێکی بالابەرز بوو ئاوێنەیەکی زۆر گەورەی بەدەستەوە بوو، بەرگێکی پەمەیی کاڵی لەبەردا بوو دەهاتە خوار ئەژنۆیەوە تاجێکی بچوکی پڕ لە گوڵی پەمەیی کردبوو بە پرچیدا، بەتوندی بەلایان دا تێپەڕیم و چومە حەوشەکە.

خەڵکەکە بووبوون بە دووئەوەندە، ژمارەیەکی زۆریان لەسەر کورسیەکان دانیشتبوون و سەرگەرمی گفتوگۆ بوون و ژمارەیەکیشیان هاتوچۆیان ئەکرد و بەخێرهاتنی میوانەکانیان دەکرد. دەنگی مۆسیقاش تا ماوەیەکی دوور دەبیسترا. لەسەر ئەو کورسیەیەی لەتەنیشتمەوە بوو دانیشتم، خەڵکەکە شادیان دەگێڕاو چەپڵەیان لێ دەدا و منیش لەنێوان ئەو هەموو سەر مەست و خۆشحالانە دا پەرێشانانە لەناو بیردا بووم و سەیرم دەکردن، گەرچی حەقیش نەبوو غەمگین بم بەلام خۆ منیش مرۆڤم و نەمدەتوانی بەربەستی هەستم بکەم، سەیرێکی دەورووبەرم کرد تا بتوانم لەنێوان ئەو خەڵکانە باوکم بەدی بکەم بەلام هەرچەندە گەڕام باوکمم نەدۆزیەوە.

کاتێک شەو داهات ئەو گڵۆپە رەنگاو رەنگانەی دایان کوتابوو بەدیوارەکەوە دایانگیرساند، باوکم بینی قاتێکی نیلی و کراسێکی سپی لەبەرما بوو لەگەڵ باوەژنەکەمدا بینیم بەرەو یەکێک لەمێزەکان

دەڕۆیشتن، باوەژنەکەم بەرگێکی درێژی سپی لەبەردابوو تاجی گوڵی سپیش درابوو لەپرچە زەردەکەی وە چەپکێك گوڵی زەردیشی بەدەستەوەبوو بەئارامی لەنێوان دەستەکانیدا دەیگوشین و پاشان باوکم و ژنەکەی پێکەوە لەسەر کورسیەك دانیشتن کە تایبەت بوو بە خۆیان و خەڵکەکەش دەستیان کرد بە چەپڵە لێدان بۆیان و من لەو نێوانەدا راستەوخۆ کەوتمەوە بیری دایکم. دایکێك ساڵەهایە مردووە و هەرگیز نایەتەوە.

دایکم لەنێوان ئەو بەرگە سپییە دا بەچاوە گەورە و دەم بە پێکەنینیەکانیەوە پەیکەر کێشا، بەئارامی چەپکە گوڵە سورەکەی دەستی بە پەنجە نەرم و نۆڵەکانی دەگوشی، ئەوم لەنێوان ئەو دەنگە دەنگ و هەلا هەلایەدا پەیکەر کێشا و لەپاڵ باوکم دا دانیشتوە، بەزەردەخەنەوە سوپاسی ئەوکەسانەی دەکرد کە پیرۆزبایی لێ دەکردن ئەوم لەنێوان چەپکە گوڵەکان رووبەڕوی ئاوێنە و مۆمەکان پەیکەر کێشا. لەوکاتەدا حەزم دەکرد لە خۆشحاڵیدا هاوار بکەم لەبەر ئەوەی دایکم لەنێوان ئەو هەموو بریسکەدا دەدرەوشێتەوە و وزەیەکی تازەم لەدڵدا هەست پێ دەکرد بەڵام ئەمانە هەمووی خەیاڵ و وڕێنە بوون، لەڕاستیدا دایکم لەنێوان خاك و خۆڵدا نوستوە و هەرگیز بوونی نیە، لەوانەشە تەرمەکەی بەتەواوی بوبێتەوە بە خاك. تەنانەت لەژێر خاکیشدا شوێنی هەر نەبینرێت، کێ ئەزانێ.

لە هەموو لایەکەوە دەنگی پێکەنین و شادی دێت وەلێ من لەگۆشەیەکدا ئارام و بێدەنگ سەیری خەڵکەکەم دەکرد، هەرچۆنێك بوو ئەم بارودۆخە تا نیوەی شەو نزیکەی تا دەمەو بەیان بەردەوام بوو میوانەکان یەکە یەکە خواحافیزیان دەکرد دەڕۆشتنەوە منیش هاتمەوە

ژوورەکەی خۆم، ماندوو بووم خێرا خەوم لێ کەوت بەیانی باوکم ماچی کردم و وتی:

بێژەن مریەم چاوەڕوانت دەکات وەرە بیبینە بزانە چەند ژنێکی میهرەبان و دڵسۆزە، من بەڵێنت پێ ئەدەم دایکێکی خۆبەخت کار و دڵسۆزی تۆ ئەبێت پاشان منی لەگەڵ خۆی بردە ژووری خوارەوە.

لەوکاتەدا باوەژنەکەم لەگۆشەیەکدا دانیشتبوو بەرگێکی ئاوریشمی سپی لەبەردا بوو لەتەنیشتیەوە چەپکێك گوڵی سور لەگوڵدانێکی جواندا دانرابوو لەلایەکی تری ژورەکەدا چەند ژنێکی بەساڵاچوو دەبینران یەکێك لەو ژنانە بەئارامی پرچی باوەژنەکەمی شانە دەکرد. باوکم منی برد بۆلای باوەژنەکەم؛ بەخۆشحاڵیەوە وتی مریەم گیان ئەمە بێژەنی کوڕمە. باوەژنەکەشم دەستی درێژ کردوو دەستمی خستە نێو پەنجە باریك و درێژەکانی خۆی و بەدەنگێکی نەرم وتی:

چ کوڕێکی باشە پاشان بە میهرەبانیەکەوە دەستێکی هێنا بەسەرم دا و ئەڵقەیەکی باریك و جوانیشم لەپەنجەکانی دا بینی زانیم ئەڵقەی هاوسەرگیریەتیەتی. بۆنێکی نەرم و خۆش لەژورەکەدا بڵاو بوبوەوە، یەکسەر باوەژنەکەم بێ هیچ پێشەکیەك پرسی: بێژەن چۆنی ؟

وەڵامم دایەوە سوپاست دەکەم، خراپ نیم. پاشان دەستی کرد بە قوتویەکدا کەلەسوچێکی ژورەکەدا بوو نوقڵێکی دەرهێناو دایبەدەستمەوە.

ئەوانەی لەدەورو پشتی باوەژنەکەم بوون بە رقو کین و خێسەوە سەیریان دەکردم منیش لەترساندا هەموو ئەندامەکانی لەشم ئەلەرزین. ئەوە یەکەم رۆژی ئاشنابوونم بوو لەگەڵ باوەژنەکەمدا. پاش ئەو رۆژە ئیتر باوکم کەمتر سەردانی دەکردم و باوەژنەکەشم تا ئەندازەیەك

دەڕۆیشتن، باوەژنەکەم بەرگێکی درێژی سپی لەبەردابوو تاجی گوڵی سپیش درابوو لەپرچە زەردەکەی وە چەپکێك گوڵی زەردیشی بەدەستەوەبوو بەئارامی لەنێوان دەستەکانیدا دەیگوشین و پاشان باوکم و ژنەکەی پێکەوە لەسەر کورسیەك دانیشتن کە تایبەت بوو بە خۆیان و خەڵکەکەش دەستیان کرد بە چەپڵە لێدان بۆیان و من لەو نێوانەدا راستەوخۆ کەوتمەوە بیری دایکم. دایکێك ساڵەهایە مردووە و هەرگیز نایەتەوە.

دایکم لەنێوان ئەو بەرگە سپییە دا بەچاوە گەورە و دەم بە پێکەنینیەکانیەوە پەیکەر کێشا، بەئارامی چەپکە گوڵە سورەکەی دەستی بە پەنجە نەرم و نۆڵەکانی دەگوشی، ئەوم لەنێوان ئەو دەنگە دەنگ و هەڵا هەڵایەدا پەیکەر کێشا و لەپاڵ باوکم دا دانیشتوە. بەزەردەخەنەوە سوپاسی ئەوکەسانەی دەکرد کە پیرۆزبایی لێ دەکردن ئەوم لەنێوان چەپکە گوڵەکان رووبەڕوی ئاوێنە و مۆمەکان پەیکەر کێشا. لەوکاتەدا حەزم دەکرد لە خۆشحاڵیدا هاوار بکەم لەبەر ئەوەی دایکم لەنێوان ئەو هەموو بریسکەدا دەدرەوشێتەوە و وزەیەکی تازەم لەدڵدا هەست پێ دەکرد بەڵام ئەمانە هەمووی خەیاڵ و وڕێنە بوون، لەڕاستیدا دایکم لەنێوان خاك و خۆڵدا نوستوە و هەرگیز بوونی نیە، لەوانەشە تەرمەکەی بەتەواوی بوبێتەوە بە خاك. تەنانەت لەژێر خاکیشدا شوێنی هەر نەبینرێت، کێ ئەزانێ.

لە هەموو لایەکەوە دەنگی پێکەنین و شادی دێت وەلێ من لەگۆشەیەکدا ئارام و بێدەنگ سەیری خەڵکەکەم دەکرد، هەرچۆنێك بوو ئەم باروودۆخە تا نیوەی شەو نزیکەی تا دەمەو بەیان بەردەوام بوو میوانەکان یەکە یەکە خواحافیزیان دەکرد دەڕۆشتنەوە منیش هاتمەوە

ژوورەکەی خۆم، ماندوو بووم خێرا خەوم لێ کەوت بەیانی باوکم ماچی کردم و وتی:

بێژەن مریەم چاوەڕوانت دەکات وەرە بیبینە بزانە چەند ژنێکی میهرەبان و دڵسۆزە، من بەڵێنت پێ ئەدەم دایکێکی خۆبەخت کار و دڵسۆزی تۆ ئەبێت پاشان منی لەگەڵ خۆی بردە ژووری خواردوە.

لەوکاتەدا باوەژنەکەم لەگۆشەیەکدا دانیشتبوو بەرگێکی ئاوریشمی سپی لەبەردا بوو لەتەنیشتیەوە چەپکێك گوڵی سور لەگوڵدانێکی جواندا دانرابوو لەلایەکی تری ژورەکەدا چەند ژنێکی بەساڵاچوو دەبینران یەکێك لەو ژنانە بەئارامی پرچی باوەژنەکەمی شانە دەکرد. باوکم منی برد بۆلای باوەژنەکەم. بەخۆشحاڵیەوە وتی مریەم گیان ئەمە بێژەنی کوڕمە. باوەژنەکەشم دەستی درێژ کردوو دەستمی خستە نێو پەنجە باریك و درێژەکانی خۆی و بەدەنگێکی نەرم وتی:

چ کوڕێکی باشە پاشان بە میهرەبانیەکەوە دەستێکی هێنا بەسەرم دا و ئەڵقەیەکی باریك و جوانیشم لەپەنجەکانی دا بینی زانیم ئەڵقەی هاوسەرگیریەتیەتی. بۆنێکی نەرم و خۆش لەژورەکەدا بڵاو بوبوەوە، یەکسەر باوەژنەکەم بێ هیچ پێشەکیەك پرسی: بێژەن چۆنی ؟

وەڵامم دایەوە سوپاست دەکەم، خراپ نیم. پاشان دەستی کرد بە قوتویەکدا کەلەسوچێکی ژورەکەدا بوو نوقڵێکی دەرهێنا و دایبەدەستمەوە.

ئەوانەی لەدەورو پشتی باوەژنەکەم بوون بە رقو کین و خێسەوە سەیریان دەکردم منیش لەترساندا هەموو ئەندامەکانی لەشم ئەلەرزین. ئەوە یەکەم رۆژی ئاشنابوونم بوو لەگەڵ باوەژنەکەمدا. پاش ئەو رۆژە ئیتر باوکم کەمتر سەردانی دەکردم و باوەژنەکەشم تا ئەندازەیەك

میهرەبان بوو بەڵام کەمێك لەخۆ ڕازی و لەخۆ بایی ئەهاتە پێش چاوم، هەمیشە کاتەکانی خۆی لەبەردەم ئاوێنەدا بەسەر دەبرد و کاتێکیش باوکم لەکار دەگەڕایەوە پێکەوە بۆ گەڕان دەڕۆیشتن.

ڕۆژان تێپەڕ دەبوون، زستان کەم کەم دەستی پێ کرد، لەباخچەی ماڵەکەماندا تەنها چەند گوڵێکی زەرد مابونەوە ئەویش سەرما بردبونی و هەڵدەوەرین.

بەدرەختەکانەوە بێجگە لە چەند گەڵایەکی زەرد نەبێت هیچی تر نەمابویەوە، باڵندە گەرمەسێرەکان زۆر زوو پۆل پۆل شارەکەی ئێمەیان بەجێهێشت و بەرەو گەرمیان دەگەڕانەوە و تەنها بەسەر لق و پۆپی درەختەکان پاساری مابویەوە و ئەمچڵ و ئەوچڵیان دەکرد، لەوماوە کەمەشدا باوەژنەکەم بەتەواوی کردار و ڕەفتاری گۆڕا، بەبێ هۆ بیانوی بەمن و دایەنەکەم دەگرت و هەندێ جاریش گاڵتەی بەو پیرەژنە داماوە دەکرد.

گشت ژوورەکانی داگیر کردبوو بۆ خۆی و منیش توانای هاتوچۆم بۆ ژورەکەی خۆم نەمابوو. ئاشکرا قسەی نەدەکرد بەڵام لە سەیرکردن و چۆنیەتی هەڵسوکەوتی دا دەردەکەوت چارەی منی ناوێت و بەبینینم بێزارە، تا ڕۆژێك باوەژنەکەم بە ڕواڵەتێکی شپرزە و تووڕەییەوە خۆی کرد بە ژورەکەمدا و پرسیاری کرد ئەم وێنەیە هینی کێیە؟ پاشان دەستی بۆ درێژکرد وێنەکەی دایکم لەنێوان دەست و پەنجە گەورەکانیدا بینیەوە، یەکسەر وەڵامم دایەوە وێنەی دایکمە.

بەتوڕەییەوە وێنەکەی تێگرتم و وتی دایکت چەند ناشیرین بووە و پاشان بەپەلە لە ژورەکەم چوە دەرەوە و منیش هیچ کاردانەوەیەکم نیشان نەدا. پاش نیوسەعات دایەنەکەم بە گریانەوە خۆی کرد

بەژوورەکەم دا و بەسەرسامیەوە پرسیم چی بووە؟ بۆچی دەگریەیت؟ سەرەتا هیچی نەوت بەڵام کاتێک ویستی بڕوات هاتە پێشەوە و بەئارامیەکەوە وتی:

مریەم خان دەڵێت تۆ نازانیت هیچ کارێک بکەیت، ئەمساڵ من سیانزەساڵە لێرە کاردەکەم هێشتا هیچ کەس پێی نەوتوم پشتی چاوانت برۆیە خۆهێشتانەبووە بە دومانگ مریەم خان هاتوەتە ئێرە هەموو رۆژێک بەهانەم پێ ئەگرێت و دەیەوێت دەرم بکات، ئەگەر ئەمجارە ئاوەهام پێبکات ئەچمەوە بۆ لادێ بۆلای کورەکەم، پاش ئەم قسانە لەژوورەکەم چوە دەرەوە بەڵام عەسر کە باوکم هاتەوە دایەنەکەم رۆیشت بۆلای باوکم و وتی گەورەم ئەمەوێت بزانم چەندساڵێکە لەم ماڵەی تۆ کاردەکەم تۆ هیچ ناڕەحەتیەکت لەدەستم هەیە یان نا؟

ئەوە چ قسەیەکە دەیکەیت، تۆ سیانزە ساڵە لێرە کارەکەیت تازە ماڵەکە وەکو ماڵی خۆتی لێهاتوە، تۆ لەجێی دایکی ئێمەیت، دایەنەکەم چاوەڕێی وەڵامێکی وابوو وتی ئەیبۆ ناپرسیت لە مریەم خان پێم دەڵێت ئەبێت لەم ماڵە بچیتە دەرەوە. لەم کاتەدا باوکم سەیرێکی هاوسەرەکەی کرد و ماوەیەك کەوتە بیرکردنەوە. باوەژنەکەم تائەوکاتە بێدەنگ بوو لەپڕ بەتوندی قیژاندی.

پیرەژنی چرچو لۆچ تۆ پێیەکت لەم دنیایە و پێکەی ترت لەودنیایە، ئیتر چەنەبازی مەکە. چەند بێ حەیایە شکاتم لێ دەکەیت من بوارت پێ نادەم دوزمانی لەکارەکانمدا بکەیت چەداوە روو مەگەر تۆ کێیت واشکاتم لێ دەکەیت؟

لەوکاتەدا باوکم وتی: مریەم تۆ بێدەنگبەو پاشان ڕوی کردە دایەنەکەم و پرسی ئەمەوێت بزانم مریەم خان چ دوژمنایەتیەکی لەگەڵ

تۆدا هەیە! ئاخر بەبێ هۆ کەس رەخنە لەکەس ناگرێ بزانە تۆ خەتاباریت و مریەم هیچ کەموو کورپەکی نیە و لەخۆڕا رەخنەت لێ ناگرێ، چاکتروایە کردار و رەفتارت بگۆڕیت، هەرچۆنێك بوو ئەو گفتوگۆیە لەوێدا کۆتایی هات.

بەڵام لەوڕۆژە بەدواوە باوەژنەکەم بەئاشکرا دەستی کرد بە دوژمنایەتی من و دایەنەکەم چونکە بەباشی دەیزانی باوکم پشتیوانی لەو دەکات. هەفتەیەك بەسەر ئەو رۆژەدا تێپەڕی. رۆژێکیان کاتێ نیوەڕۆ گەڕامەوە و چومە ژورەکەی خۆم بەوپەڕی سەرسامیەوە سەیرم کرد ئەو ئەلبومەی وێنتەکانی دایکمی تێدابوو لەسەر مێزەکە نەماوە، بەپەلە چومە نهۆمی خوارەوە و لەهۆڵەکەدا چاوم بە دایەنەکەم کەوت دایەنەکەم بینی فرمێسك بەچاومەوەیە پرسی چی بووە بێژەن؟

یەکسەر وەڵامم دایەوە ئەلبومەکەی منت نەبینیوە ئەو بەبیستنی ئەم قسەیە یەکسەر کەوتە ناو فکرەوە و پاشان وتی بەڵێ ئەزانم وەلێ ئەترسم راستیەکەیت پێ بڵێم.

بەردەوام لەناو قسەکانیدا وتم لەچی ئەترسی زوکە ئەلبومەکەم لەکوێیە؟

ئەو بەهێواشی سەری نزیك کردەوە لەگوێم و وتی: مریەم خان ئەمڕۆ ئەلبومەکەتی خستە ناو ئاگرەوە و سوتاندی.

بەپەلە چومە ژوری باوەژنەکەم، بەرێکەوت باوکیشم لەوێ بوو لەکاتێکدا لەئەنجامی ناڕەحەتی تەواوی لەشم دەلەرزی، بەپەلە وتم: مریەم خان تۆ نازانی ئەلبومەکەی من کێ هەڵیگرتوە لەسەر مێزەکە بوو ئێستا لێی نەماوە، نازانم کێ هەڵیگرتوە.

تاچـەند خولـەکێ وەڵامـی پرسـیارەکەمی نەدایـەوە و پاشـان قرتێنەیـەکی سوری بەدەستەوە بوو بەستی بەقژیـەوە و پاشان هاتە پێشەوە و وتـی: ئەلبومەکـەی ئـەم ڕێـزدارە وون بـووە چ پەیوەندیـەکی بەمنەوە هەیە ئاگات لـێ ی بوایە دەتەوێت من شەو و ڕۆژ پاسەوانی ژورەکـەی تـۆبم. کاتێـك بارودۆخەکـەم بەوشـێوەیە بینـی بەپەلـە لەژوورەکەی چومە دەرەوە، هێشتا نەگەیشتبومە داڵانەکە باوکم بانگی کـردم بەناچاری دووبـارە چـومەوە ژوورەوە، بـاوکم بەمیهرەبانیەکـەوە وتی:

مریـەم گیان مـن ئـەزانم بێـژەن هـیچ مەبەستێکی نـەبووە لـەم قسانە تـەنها ئەیـەوێت بزانێت ئەلبومەکـەی لـەکوێ یـە. ئاخر ئەوەنـدە بەپەلـە خۆی کرد بەژووردا من وامزانـی دونیا ڕوخـاوە ئـەلبوم کـەی ئەوەنـدە بەنرخە قسەی لەباردوە بکەین. باوکم دوبارە وتـی ڕاست دەکەیت بەڵام لەبەر خاتری من لەتاوانی بێژەن ببوورە و ئەگەر ئەشزانی ئەلبومەکەی لەکوێیە نیشانی بدە.

لەوکاتەدا باوەژنەکەم وەکو گڕکانێك تەقیەوە و هەستایە سەر پـێ، وتـی ئێستا وات لێهاتوە پشتیوانی لـەم کـوڕە چەداوەڕوە بکـەیت، من ئەلبومەکـەم سوتاند،تێگەیشتی؟ ئەگـەر چـەنەبازیش بکات من هـەموو ژوورەکەی دەسوتێنم بەنەرمی یەکەیەوە.

وتم : مریــەم خــان چ گونــاهێکم کــردووە تــۆ ئەوەنــدە تورەیــت بەدەستمەوە. لەوەڵامدا دەستی کرد بە پێکەنینی بەرز و پاشان وتـی: بەسە ئیتر خۆت گوناح مەکە دەتەوێت چ کارێك بکـەیت لـەوە زیاتر، خەتای منە ئەگەر ئەوەندە ڕووت پێنەدەم و میهرەبان نەبم لەگەڵت تۆش واناکەیت.

شەو و ڕۆژ لەگەڵت زەحمەت دەکێشم و دڵسۆزیت بۆ دەکەم، ئەگەر وەکو باوەژنەکانی تر برسیم دەکردی کاری گرانم بدایا بەسەرتدا ئەوکات چ ڕەفتارێکت دەکرد لەگەڵم؟ پاشان ڕووی کردە باوکم وەکو بێ خەتایەك پرسی؟

ئەگەر تۆ لەجێی من بویتایە چیت لە بێژەن دەکرد؟ باوکیشم وەڵامی دایەوە، ئاخر مریەم گیان، من نازانم چ باسە، تۆ بارودۆخەکەم بۆ باس بکە تا تێبگەم لەم نێوەندەدا کامتان تاوان بارن .

باوەژنەکەم دەستی گرت بەکەمەریەوە وەکو گورگێکی برسی خۆی مەڵاس دابێت لە نێچیر و خۆی بۆ هێرش بردنەسەر ئامادە کردبێت بەرەو لای من تەکانی داو قیژاندی ئەمڕۆ بەیانی چومە ژورەکە کاتێك سەیری ئەلبومەکەیم کرد پڕبوون لە وێنەی دایکی و تەنانەت یەك وێنەی من هەر بۆ نمونەش لەئەلبومەکەیدا نەبوو. لەم کارەی زۆر نیگەران بووم و ئەلبومەکەیم هێنا بۆ چێشتخانە و سوتاندم و پاشان بوو بە خۆڵەمێش. ئێستا ئەگەر دایکی خۆش دەوێت بڕوەات بۆ چێشتخانەکە پرسەی خۆڵەمێشەکەی بکات.

پاشان لەبەرخۆیەوە وتی: وێنەی ئەو ژنە ناشیرینە نابێت هەڵبگیرێت. بەچاوی پڕ لەفرمێسکەوە ئەوانم جێهێشت، باوکیشم بەدوامدا هات و لەدالانەکەدا دەستمی گرت و وتی: مریەم ڕاست دەکات، ئەو زۆر میهرەبانە بۆ تۆ هەرکەسێکی تربوایا هەر ئەو ڕەفتارەی لەگەڵت دەکرد. چاکتروایە خۆت چاك بکەیت، من چەندجارە بەتۆ دەڵێم مریەم زۆر دڵسۆز و فیداکارە بۆت پێویستە تۆش دڵسۆز و میهرەبان بیت بۆی. هەوڵ مەدە لەوەزیاتر ناڕەحەتی بکەیت، بەویست و

ئارەزووی مریەم رەفتار بکە ئەوکاتە دەبینی چەند خۆشی دەوێیت، وەکو کوڕی خۆی پارێزگاریت لێدەکات.

پاشان باوکم خێسەیەکی لێکردم و ڕۆیشت. باوکم چوو بۆلای باوەژنەکەم، باوکم بەتەواوی گۆڕا، من بەباشی هەستم پێدەکرد چونکە کەمتر دەهاتە ژورەکەم و کەمتر سەردانی دەکردم و کەمیش قسەی لەگەڵ دەکردم ئەگەر جار جارەش قسەی لەگەڵ بکردمایە دەربارەی ئەوبابەتە قسەی لەگەڵ دەکردم زیاتر میهرەبان ببم لەگەڵ باوەژنەکەم، لەبەر ئەوەی بەو باس و خواستە کۆتایی پێبهێنم هەر ئەوسەعاتە یەکێك لەوێنەکانی باوەژنەکەم دەرهێناو هەڵمواسی بەژورەکەمدا، ئێوارە کاتی خۆرئاوا باوکم و باوەژنەکەم پێکەوە ڕۆیشتن بۆ پیاسە کردن، منیش ڕۆیشتم بۆ ژوری دایەنەکەم.

ژورەکەی ئەو لەحەوشەکەدا بوو دەوروبەریشی بەچەند باخچەیەك دەورە درابوو، چەند دار هەڵوژە و سێویشی لێ ڕوابوو، لەژورەکەیدا تەنها کومبارێکی کۆنە و دڕاو ڕاخرابوو، جلوبەرگەکانی خستبوە ناو سندوقێکی تەختەوە، لق و پۆپی دارسێوەکان لەپەنجەرەکەیەوە دیاربوون.

کاتێك چومە ژورەکەیەوە سەرنجم دا سەرگەرمی کۆکردنەوەی پڕ و پریاسکەکانیەتی. چومە پێشەوە و وتم : بڕیارت داوە ئیتر بەجێمبهێڵیت؟ ڕومەتی ماچکردم و وتی: بەڵێ ئەمەوێت ئێرە بەجێبهێڵم چونکە مریەم خان دیسانەوە ئازارم ئەدات، لەبەر ئەوەش تائێستا لێرە ماومەتەوە تەنها لەبەرخاتری تۆ بووە، چونکە تۆ وەکو منداڵی خۆم وایت. کاتێك دووساڵانە بوویت من گەورەم کردیت

ئێستاش گەورەبویت و پێویستت بەمن نی یە، منیش پیر بووم ناشتوانم کار بکەم پێویستە بڕۆمەوە بۆلادێ بۆلای کوڕەکەم.

دەستم کرد بە هاوار هاوار، نابێت تۆ لێرە بڕۆیت چونکە من تەنها دەکەوم. من پێویستم بەتۆیە وادەزانی گەورەبووم و پێویستم بەناز نی یە، نە وەهانی یە من هەمیشە پێویستم بەتۆ و خۆشەویستیەکانی تۆیە، کاتێک بەخوڕ دەگریام دەستەکانمی گرت و وتم : هەرگیز پێم مەڵێ ئەڕۆم، بەتەنها جێم مەهێڵە. کاتێک بینی زۆر دەگریەم و ئەشك ئەڕێژم وتی مەگریە بەقسەت دەکەم و ناڕۆم، من ئەوشەوە بەربەستی رۆیشتنەکەی بووم بەلاّم دەمزانی هەر رۆژێك بێت ناچاردەبێت و جێمدەهێڵێت.

رۆژی دواتر بەیانی کاتژمێر سەعات (٨) بوو خەریك بوو دەچووم بۆ قوتابخانە، لەناکاو باوەژنەکەم بەپەلە هاتە ژوورەکەم، ئاشکرابوو تازە لەخەو هەستابوو بەرگێکی پەمەیی درێژی لەبەردابوو تۆڕێکی شینی بەسەردادا بوو. بەتوڕەی یەوە قیژاندی دەمەوێت (جیمی) بکەمە دەرەوە ئەم سەگە پیسە تەواو ئازارم دەدات. وتم: چی کردووە؟ قیژاندی ئەتەوێت لەوە زیاتر چی بکات، هەموو گوڵدانەکانی شکاندووە، ئەمڕۆ دەرگای دالآنەکەم بەستبوو چون هەوا زۆرسارد بووە و دەرگای دالآنەکە داخرابوو جیمی خۆی لەپەنجەرەکەوە هەڵداوەتە ژوورەوە و گوڵدانەکانمی شکاندووە، ئێستا ئەمەوێت دەری بکەم.

بەتوڕەییەوە وتم : جیمی خوی بەمماڵەوە گرتوە و هەرگیز لەم ماڵە ناچێتە دەرەوە، دەری مەکە باوکم زۆری خۆش دەوێت. وەلآمی دایەوە: بێدەنگبە ئیتر، چەنەبازی مەکە، ئێستا ئەبینی چۆنی دەردەکەم و پاشان بینی وێنەکەی ئەو بەژورەکەمدا هەڵواسراوە وتی: بیژەن کێ

مۆڵەتی بەتۆ داوە وێنەی من هەڵبواسی بەژوورەکەی خۆتدا، پێم بڵێ ئەم وێنەیەت لەکوێ هێناوە؟ تۆ بەچ مافێك دەستت داوەتە وێنەکانی من هەی هەتیوی بێ ئەدەب.

وتم : لەکتێبخانەکە دەرمهێناوە مەگەر تۆ دایکی دڵسۆز و میهرەبانی من نیت چۆن مۆڵەتی ئەوەم نی یە وێنەی دایکی خۆم هەڵبواسم بەژوورەکەمدا. بەپەلە دەستی هێنایە پێشەوە وێنەکەی داگرت و وتی: من پێم نەنگە دایکی تۆبم، چون ئەتوانی من بەدایکی خۆت بزانی، پاشان بەپەلە چوە خوارەوە تا جیمی بکاتە دەرەوە، منیش دوابەدوای ئەو بەپلەکاندا چومە خوارەوە، هەرچەندە هەوڵی دا جیمی بکاتە دەرەوە نەیتوانی چونکە ئەو ئاژەڵە بێزمانە ئامادە نەبوو ئەوماڵە بەجێبهێڵێت و باوەژنەکەم کاتێك بینی سەگەکە دەرناچێت مێلەیەکی ئاسنی لەحەوشەکە هەڵگرت و بەرەو رووی سەگەکە رۆیشت هەرکە نزیك بوەوە لێی بەئاسنەکە چەندجارێك کێشای بەسەری ئەو سەگە بەستەزمانەدا. ئیتر نەمزانی چی بوو، چاوی خۆم گرت بۆئەوەی ئەو دیمەنە ناخۆشە نەبینم، جیمی بە قورسکە قورسك لەحەوشەکە چوە دەرەوە، بەپەلە خۆمم گەیاندێ سەری شکابوو، هاتمەوە ژورەکەی خۆم و کەمێك لۆکەم بردوو گەڕامەوە لای جیمی، لۆکەکەم خستە سەر برینەکەی بۆئەوەی بەربەستی خوێن رێژیەکەی بکەم و چوون سەعات بووبە هەشت و نیو نەچووم بۆ قوتابخانە.

کاتێك ویستم بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە جیمیش دەیویست بەدوامدا بێتە ژوورەوە بەڵام من خێرا هاتمە حەوشەکە و دەرگاکەم بەڕوی جیمیدا داخستەوە چونکە ئەگەر رێگام پێبدایە بێتە ژوورەوە رەنگ بوو باوەژنەکەم تورە ببێت و خۆشم بکاتە دەرەوە بەڵام جیمیش هەروا

تانیوەڕۆ لەپشت دەرگاکە مایەوە و چاوەڕوان بوو تا کەسێك بیکاتە ژوورەوە، ئەو ئاژەڵە زمانی نەبوو تا بەرگری لەخۆی بکات، کاتێك باوکم لەفەرمانگە گەڕایەوە لەدەرگاکەدا دایەنەکەم هەمووشتێکی بۆ باس کرد، باوکم جیمی هێنایەوە ژورەوە باوەژنەکەم کاتێك بەمەی زانی بەپەلە خۆی گەیاندە باوکم و وتی: ،

من ناهێڵم جارێکی تر جیمی بێتەوە بەمماڵەدا ئاخر تۆ بەیانی دەڕۆیت نیوەڕۆ دێیتەوە پاش نیوەڕۆش نیت لەماڵەوە و ئاگات لێرە نی یە من چ ئازارێك دەکێشم و نازانیت لەم ماڵەدا چەند ناڕەحەت دەبم. باوکم قسەکەی پێبڕی و وتی:

تۆ راست دەکەیت من ئاگام لە هەموو شتێکە، ئیتر کارێکی وادەکەم تۆ لەم ماڵەدا هەست بەناڕەحەتی نەکەیت، بەڵام مریەم گیان ئەم بەستەزمانە گوناهە هیچ ئازارێکمان نادات و لەخۆتەوە دەرت کردوە، نەیهێشت وەڵامی بداتەوە باوکم دەستی گرت و وتی: بێ هۆ خۆت تورە مەکە ئازیزگیان و پێکەوە چونە ژورەکەی خۆیان، منیش لەو رۆژە بەدواوە کردار و رەفتارم بەتەواوی گۆڕی بۆئەوەی بەدڵی باوەژنەکەم بکەم و کینە لەنێوانماندا دروست نەبێت. بەڵام وەك بڵێی ئەو لەیەکەم رۆژەوە لەگەڵ منددا دوژمنایەتی هەیە، هەرچۆنێك بجولامایەتەوە رق و کینەی بەرامبەرم زیاتر دەبوو.

وەرزی پایز تەواو بوو زستان دەستی پێ کرد، رەشەبا هەڵی کرد و گەڵا هەڵوەریوەکانی بەم لاو ئەو لادا لول دەدا. لانەی باڵندەکان و کەلاوەی هەژارەکانی تێك و پێك دەدا. سەرما رۆژ لەدوای رۆژ زیاتر دەبوو. ئەوانەی سەرمایەدار بوون نەك لە زستان نەدەترسان بەڵك و

لەبەلای تری ئاسمانیش نەدەترسان بەلام ئەوانەی هەژاربوون و هیچیان نەبوو بەهەلکردنی رەشەبا دلیان دادەخورپا.

لەگەلْ دەستپێکردنی زستان باوەژنەکەم رۆژانە بەمەبەستی شتکرین لەمالْ دەچوە دەرەوە، جل و بەرگی گران، پالْتاوی چەرم و شتی گرانی دەکری، ئەوەی حەزی لێدەکرد دەیکری، کەسێکیش نەبوو پێی بلێ جل و بەرگ تەنها بۆ پاراستنە لە سەرماو گەرما نەك پالْتاوی چەرمی گرانبەهای لەو جۆرە، لەکاتێکدا مالێك لەنزیکمانەوەن پارەیان نیە تەنها یەك دەست جل و بەرگ بکرن، هەرچەندە خۆشم بەرگی زستانەم نەبوو بەوسەرمایە هەموو رۆژێك ناچاردەبووم پەنابەرم بۆ گۆشە و کەنار، ئەم بابەتەشم بە باوەژنەکەم راگەیاند لەوەلامدا وتی:

ئەریْ بێژەن تۆ بەتەمای چیت، چیت لێمان دەوێت باوکت شەو و رۆژ زەحمەت دەکێشیْ و هەرچیەکی دەست دەکەوێت بەناچاری دەیدات بە خەرجی قوتابخانەی تۆدا بۆچی بەزەیت پێیدا نایەتەوە ئەگەر رەقیش ببیتەوە لەسەرما نابێت پێیبلێیت چونکە لەوانەیە پارەی نەبێت و نەتوانێت بۆت بکرێت، بێژەن نابێتْ پێی بلێن جل و بەرگت نی یە من زۆر بەزەییم پێیدا دێتەوە چونکە ئەم هەموو زەحمەتە دەکێشێت هێشتا نەیتوانیوە جل و بەرگی زستانە بۆ خۆیشی بکرێت مەگەر نابینیت پالْتۆی پاری لەبەردایە.

ویستم بلێم ئاخر پارەکانی گشت دەداتە دەست تۆ تۆش دەیدەیت بەیەك دەست جل ربەرگ بۆ خۆت و لەبەر ئەوەش ناتوانێت بۆخۆی بکرێت، بێدەنگ بووم چون ئەگەر ئەوقسانەم بکردایە زیاتر دوژمنایەتی دەکردم لەبەر ئەوەش وام بەچاك زانی بێدەنگ بم، باوەژنەکەم بینی هیچ نالێم نازانم بەزەیی پێمدا هاتەوە یان شتێکی تر لەژورسەردابوو وتی:

بێژەنگ لەبەرئەوەی جل وبەرگی زستانەت نی یە برایەکم هەیە دەستێك چاکەت و پانتۆڵی زستانەی هەیە و پێویستی نی یە دەیدەم بەتۆ، چوە ژوری چێشتخانەکە و لەپشت کورسیەکی تەختەوە چاکەت و پانتۆڵێکی شڕەی دەرهێنا و نەك هەر شڕە بەڵکو هەمووی کون کون و رەنگیشی هەر نەمابوو، دای بەدەستمەوە.

وتم : خۆ هەموو گیانی کون کونە چی لێبکەم، لەوەڵامدا زەردەخەنەیەکی کردوو پاشان بەپەلە لێمی سەندەوە و وتی جگە لەوە هیچ چارەیەکی ترم پێناکرێت، لەبەر ئەوەی سەرماکە زۆر کاریگەر بوو دەترسام نەخۆش بکەوم ناچار لێم وەرگرت و بەرەو ژووری دایەنەکەم رۆیشتم تا بۆم بشوات، هەرکە چوومە ژورەوە سەرنجم دا لەسەر قەرەوێڵەکەیدا راکشاوە، لەوانەیە نەخۆش بێت بەئارامی چومە ژورسەری و دەستم گرت بەناوچەوانیەوە چاوەکانی نوقاندبوو کاتێك هەستی بەدەستم کرد چاوەکانی کردەوە و خێرا لێم پرسی چۆنی لەکاتێکدا لەتاو خەفەت قورگی گیرابوو بەزەحمەت وەڵامی دایەوە : لەدوێنێ شەوەوە تائێستا سەرم گێژدەخوات ناتوانم یەك هەنگاو بڕۆم ئەمڕۆش باوکت زووهات بۆئێرە و وتی: ئیتر مریەم خان خۆی کاروبارەکانی ماڵەوە دەکات، پێویستی بەتۆ نی یە و دوسەدو پەنجا تمەنیشی پێدام بۆئەوەی حەز لە هەرکوێ بکەم بڕۆم، وتی دەبێت بەیانی بڕۆیت و لێرە نەمێنیت، بێژەن گیان من چەندین ساڵە لێرە کاردەکەم تەنانەت تۆم گەورە کرد کاتێك هاتم بۆ ئێرە لەساڵێك زیاتر نەدەبوویت خۆشت دەزانی چەند ساڵە لێرەدا کار دەکەم زەحمەت دەکێشم بەڵام باوکت بەڕاستی پارەیەکی چاکم پێدەدات ئەو هەموو زەحمەتانەی منی لەبەرچاو نی یە و لەماڵەکەی دەمکاتە دەرەوە چ

رۆژگارێکی خراپە بەم بەیانیە کاتێکیش هاتە ژوورەوە بینی چەند نەخۆشم بەڵام بەتوڕەییەوە وتی بەیانی لێرە نەمێنی و تەنانەت دو رۆژیش مۆڵەتی نەدامێ تا چاك ببمەوە و ئەوسا بڕۆم، فرمێسك بەچاوانمدا دەهاتە خوارەوە.

وتم: کەواتە دەڕۆیت لێرە نامێنیت؟ وەڵامی دایەوە بەڵێ دەڕۆمەوە بۆ لادێ بۆلای کوڕەکەم، خۆ بێکەسیش نیم کوڕەکەم دەمخاتە سەر چاوی ئیتر هیچم نەوت دەمتوانی بڵێم چی؟ ئەویش هیچی نەوت چونکە زۆر نەخۆش بوو خێرا دەستم کرد بە کۆکردنەوەی شتەکانی ئەویش بەناڕەحەتی هەستایە سەرپێ و دەستی کرد بە شۆردنی ئەو قاتە جلەی باوەژنەکەم پێی دابووم، رۆژی دوایی دایەنەکەمماڵەکەی چۆڵ کرد.

ئەو رۆیشت، منیش لەجیهانێکی پڕ پەژارەیدا مامەوە، لەبەر ئەوەی سیانزەساڵی رەبەق بە شەو و رۆژ لەگەڵمدا بوو کاتێك فامم پەیداکرد قەدری ئەوم دەزانی و ئەو شەوانەی خەوم لێنەدەکەوت دەهاتە ژوور سەرم و چیرۆکی بۆدەگێڕامەوە و هەتا خەوم لێ نەکەوتایە نەدەخەوت چون بەچاوی منداڵی خۆیەوە سەیری دەکردم و منیش وەکو دایکێك خۆشم دەویست و وەکو کەسێکی نزیکم لێ مردبێت وەهابووم بەڵام باوەژنەکەم پێی خۆش بوو.

یەك مانگ تێپەڕی و باوەژنەکەم هیچ نرخێکی بۆدانەدەنام و وەکو دوژمنی باوك کوشتەمان لێهاتبوو و ئەو چاوی بەرایی نەدەهات سەیری من بکات و وایدەزانی ژیانی کامەرانیم لێسەندووە و منیش نەمدەتوانی دوژمنایەتیە لەڕادەبەدەرەکەی تەحەمول بکەم و لەبەر ئەوهۆیەش کینە و رقەبەرایەتیمان رۆژ لەدوای رۆژ زیاتر دەبوو.

لەڕاستیدا من تاوانم نەبوو چونکە ئەو سەرتا تۆوی ڕکەبەرایەتی چاند هەرچەندە من هەمیشە لەبەرامبەریدا گوێڕایەڵی بووم و ئەگەر دەستی لەدوژمنایەتی هەڵبگرتایە بێگومان وەکو دایکم خۆشم دەویست.

لەکۆتایدا... شەوێکی زۆر سارد باوکم هات بۆلام و بەئارامی پێی وتم : بێژەن تۆ ئێستا لەپۆلی سێیەمی ناوەدیت و بەئەندازەی پێویست دەرست خوێندووە، وای بەباش دەزانم قازانجت لەوەدایە لەبەیانیەوە نەچیتەوە بۆ قوتابخانە چون مریەم خان ناچارە هەموو کارەکانی ماڵەوە بەتەنهایی بکات ئایا چاکتر وانیە تۆ لەماڵەوە بمێنیتەوە و یارمەتی بدەیت و بڕۆیتە خوێندنی شەوانە؟ پاشان پرسیاری کرد پێت چۆنە بێژەن؟

سەرەتا هیچم نەووت لەبەر ئەوەی دەمزانی باوکم توڕەیە و زوو هەڵدەچێت بەهێواشی لەژێر لێوەوە وتم هەرچی تۆ بیڵێیت من ئەوە دەکەم، ئەویش کاتێك بینی رازی بووم زەردەخەنەیەکی کردوو پاشان دەستێکی هێنا بەسەر جیمیدا کەلەتەنیشتمەوە بوو پاشان ڕۆیشت لەبەر ئەوەی پاڵتۆیەکی ئەستوری لەبەردابوو هەستی نەکرد ژورەکەم چەند ساردە، ڕۆژی دوایی نەڕۆیشتم بۆ قوتابخانە چوون بەڵێنم دابوو بە باوکم و دەستم کرد بە ئیشکردنی ماڵەوە لەگەڵ باوەژنەکەمدا.

لەوڕۆژەدا تەنها شتم کڕی چونکە باوەژنەکەم هەر ئەو ئەرکەی دابوو بەسەرمدا و کارەکانی تر تەنها خۆی بەتەنهایی ئەنجامی دەدان بەڵام دوای ئەوڕۆژە کەم کەم کاری زۆرتر و قورستری دەدا بەسەرمدا تا کار گەیشتە ئەوڕادەیەی قوتابخانەی شەوانیشم لەکیش بچێت چونکە هەموو کاتەکان بەتەنهایی خەریکی کارکردن بووم و هیچ کاتێکم

بەدەستەوە نەما تا شەوانە بڕۆم بۆ خوێندن، بەیانی زوو دەڕۆیشتمە دەرەوە بۆ شت کڕین و پاش نیوەڕوانیش سەرگەرمی گسک دان و قاپ و دەوری شۆردن بووم و کاری باوەژنەکەم تەنها ئەمر کردن بوو بەسەرمدا و دەستی لەهیچ شتێکەوە نەدەدا.

من کەم کەم وەکو نۆکەرێکم لێهات، شڕی جل و بەرگەکانم و لاواز بوونم ئەو راستیەی سەلماند، بەپێڵاوی و دڕاوەوە دەڕۆیشتم بۆ شت کڕین و نیوەڕوانیش ئەوەندە لەگۆشەی چێشتخانەکەدا راوەستاوم تا باوەژنەکەم پاش خوانێکم پێبدات، شەوانیش بەو سەرما سارده لەژێر بەتانیەکی بچوکدا لەچێشتخانەکە دەخەوتم، بەو باروخۆخە خەفەتێکی زۆرم دەخوارد بەڵام جگە لە بێدەنگی هیچ چارەیەکی ترم نەبوو.

بێدەنگیە کوشندەکەی باوکم، وەکو ئاغایەکی لێهاتبوو وایدەزانی هیچ ئاشنایەتیەکی لەگەڵمدا نیە و تەنها لەبەر خوایە لەومالەدا جێی کردبێتمەوە وەکو نۆکەرێك سەیری دەکردم ئەویش وەك باوەژنەکەم فەرمانی دەکرد ئەگەر بچوکترین سەرپێچیم بکردایە دارکاری دەکردم، باوکم زۆر خۆش دەویست چونکە بەچاکی دەمزانی باوەژنەکەم فریوی داوە، ئەو دوانە رەفتاریان زۆر نامرۆڤانەبوو لەگەڵمدا و بچوکترین بەزەییان پێمدا نەدەهاتەوە.

رۆژانیش هەروا تێدەپەڕین و پایزیش تێپەڕی هەندێجار بەفر دەباری، سەرما زۆری دەهێنا و خەڵکی بەرگی زستانەیان لەبەرکرد بەڵام نەك تەنها بەرگی زستانەم نەبوو بەڵکو پێڵاوەکانیشم بەتەواوی دڕا و نەمددتوانی هاتوچۆیان پێوە بکەم، بەباوەژنەکەم راگەیاند و تکام لێکرد پێڵاوە کۆنەکانی باوکم پێبدات، بەڵام پێی وتم: ئاخر ئەو پێڵاوانە گەورەن و بەپێت ناکەن ئەو پێڵاوانە پڕبەپڕی پێی نۆکەرەکەی

ماڵ دایکمە و بەنیازم بیدەم بەو، هیچم نەوت. چونکە ئەگر قسەیەکم بکردایە و بەدڵی نەبوایە تالاوەکەیم دەنۆشی لەبەر ئەوەی هەرگیز چاوپۆشی لەهەڵەم نەدەکرد.

رۆژێکیان بەیانی بەمەبستی شت کڕین لەماڵ چومە دەرەوە لەناکاو پیاوێکی کورتەبالام لەبەر قاپیەکەدا بینی سەیری پەنجەرەی باوەژنەکەمی دەکردو بەئارامی و لەسەرخۆ دورکەوتمەوە و لەپشتی درەختێکدا خۆم شاردەوە و جوڵەو رەفتاری ئەوپیاوەم خستە ژێر چاودێریەوە، روخسارێکی ئێجگار ناشیرین و ترسناکی هەبوو، پاش چەند خولەکێك بینیم چوە ماڵەوە زۆرسەرسام بووم، لەوڕۆژە بەدواوە دوجاری تر ئەوپیاوەم لەنزیك ماڵی خۆمانەوە بینی و تاڕۆژێك عەسر لەبازاڕ دەگەڕامەوە سەرنجمدا لەژوری باوەژنەکەمدا دانیشتوە و سەرگەرمی گفتوگۆن، لەهۆڵەکەدابووم دەمویست بڕۆم بۆ چێشتخانە گوێم لە باوەژنەکەم بوو دەیگووت:

من لەسێ هەزار تمەن زیاتر ناتوانم بدەم ئەویش وتی پێویستە کارەگرنگەکەی ئێمەتان لەبەرچاوبێت چونکە سێ هەزار تمەن کەمە دوای ئەوە هیچی ترم گوێ لێنەبوو، لەئێوارەدا باوەژنەکەم بانگی کردم و وتی بێژەن ئیمشەو میوانمان هەیە و باوکت دەیەوێت سندوقێك پرتەقاڵ بکڕێت تۆ لەگەڵی بڕۆ سندوقە پرتەقاڵەکە هەڵبگرە چونکە لەوانەیە کەسی دەست نەکەوێت سندوقەکە بنێرێتەوە بۆ ماڵەوە.

منیش راستەوخۆ کەوتمە دوای باوکم. باوکم چاویشی کەوت بەپێ پەتیەکەی من کەچۆن نوقم دەبوو لەبەفردا و رەنگ وروخسارە زەرد هەڵگەڕاوەکەشمی بینی بەڵام کەمێك بەزەیی پێمدا نەهاتەوە. بەڕاستی نازانم ئەو هەموو میهرەبانی و خۆشەویستیەی باوکم چۆن یەکسەر

لەناوچوو، ئەو هەموو خۆشەویستیە رق و کین جێگەی کردەوە ئایا هەموو پیاوێك کاتێك عاشقی ژنێك دەبن عەشقی منداڵەکانیان فەرامۆش دەکەن، یان تەنها باوکی من وەهایە هەرچۆنێك بوو کاتێك باوکم سندوقە پرتەقاڵەکەی کڕی خستیە سەر پشتی من و هێنامەوە بۆ ماڵەوە ئەوەندە قورس بوو چەندجارێك لەناو ئەو بەفرە زۆرەدا کەوتم و باوکیشم دەستی دەگرتم و هەڵی دەساندمەوە، بەهەر زەحمەتێك بوو سندوقەکەم گەیاندە ماڵەوە پاشان باوکم سندوقەکەی هەڵپڕچی و دانە دانە پرتەقاڵەکانی کردە ناو قاپەکان و خستیە سەر مێزەکان و شەویش باوەژنەکەم بانگی کردم بۆ ژورەکەی خۆی لەوکاتەدا قژی خۆی لەبەر ئاوێنەدا دادەهێناو بەئارامیەکەوە وتی بێژەن ئەمشەو گلۆپەکانی سەرشەقامەکان دانەگیرساون لەگۆشەی چێشتخانەکەدا چرایەك هەیە هەڵیبگرە و بیگرە بەدەستەوە پاش ئەوەی داتگیرسان بڕۆرە سەرجادەکە لەگۆشەیەکدا رابوەستە تا میوانەکان دێن چونکە هەوا تاریکە لەوانەیە میوانەکان نەزانن بێە ژورەوە و ناڕەحەتیان بکات.

پاش ئەم قسانە شانەکەی خستە ناو چەکمەجەی مێزەکەیەوە، چوەلای پەنجەرەکە و پەردە پەمەییەکانی بەپەنجە جوان و ناسکەکانی لادا، وتی بێژەن دەرەوە تاریکە زووکە لەوانەیە میوانەکان بێن و منیش بێ ئەوەی نقەیەك بکەم بەهێواشی لەژورەکەی چومە دەرەوە و چومە چێشتخانەکە، هەوا زۆر تاریك بوو ئەوچرایەی کەلە گۆشەی چێشتخانەکەدابوو هەڵمگرت و راستەوخۆ چومە سەر جادەکە و لەپەنای جادەکەدا چاوەڕێی میوانەکانم دەکرد.

هیچ کەسێك لەسەر جاکەدە بەدی نەدەکرا هەوا زۆر تاریك بوو تەنها لەدورەوە دوکەڵی زۆپای ماڵەکان بەدی دەکراو بڵاو دەبوەوە

بەئاسـنـدا، زۆرم سـەرمابوو لـەتاو سـەرما هـەموو گیـانم دەلـەرزی نیوسەعات لەبەر ئەوسەرما زۆرەدا راوەستام تا میوانەکان گەیشتن.

پاشـان راسـتەوخۆ بـەخێرهاتنی میوانـەکانم کـرد بـۆ ژوری میوان ئـەوژوورەی کـە باوەژنەکـەم رازاندبویـەوە لەناوەڕاسـتی ژورەکـەدا ئاوێنەیەکی گەورە و دوومۆم دانی زیوی دانابوو، لەبەرامبەر ئاوێنەکەدا گوڵـدانێکی دانـابوو کـەپڕبوو لـەگوڵ مێخـەکی سـور، لەناوەڕاسـتی ژورەکەشدا مێزێکی گەورەی دانابوو سەر مێزەکە پڕبوو لە دەوری میوە و شـیرینی، لـەنێوان میوانەکانـدا، دوو ژنـی بەتەمـەنیان لەگەڵـدابوو یـەکێکیان بـەرگێکی خۆڵەمێشی لەبـەردابوو تـۆڕێکی رەشیـشی دابـوو بەسـەریدا و میوانـەکانی تـر هـەموویان کـچۆڵەی ناسك و جـوان بـوون، لەوکاتەدا باوەژنەکەم هاتە ژورەوە کراسێکی سوری گوڵ گوڵی جوانی لەبـەردابوو کاتێـك نزیـك بویـەوە لەمیوانـەکان هـەمویان ماچیان کـردوو یەکێك لەوکچە جوانانە وتی:

مریـەم بەڕاسـتی زۆر جـوان بوویـت، باوەژنەکـەم زەردەخەنەیـەکی کـردوو وتـی سوپاسـت دەکـەم لەبـەر ئـەوەی کاتەکـە درەنـگ بـوو باوەژنەکـەم خێـرا نـانی ئێـوارەی ئامادەکرد، بەپەلـە دەوریـەکانم بـردە ژورەکە پاشان میوانەکان هەموویان سەرگەرمی نانخواردن بوون، منیش لەگۆشەیەکدا راوەستام بۆئەوەی ئەگەر کارێکیان بوو ئەنجامی بدەم.

بەتبـەختی و برسـی و سـەرمابردوو سـەیری هـەموویانم دەکـرد باوکیشم لەنێوانیاندا بوو. لەوکاتـەدا باوەژنەکەم رویکـردە میوانەکان و وتـی بـەخوا کاروبـاری ماڵـەوە زۆر ناڕەحـەتی کـردووم نـازانم چیبکەم پاشـان یـەکێك لـە کـچەجوانەکان وەڵامـی دایـەوە مریـەم گیـان خۆتـۆ نۆکەرت هەیە نابێت ئەوەندە خۆت ناڕەحەت بکەیت و کارە قورسەکان

بکەیت، کارە قورسەکانت بدەبە نۆکەرەکەت بابیکات، پاش ئەوقسەیە بێدەنگیەك سەرانسەری ژورەکەی گرتەوە هیچ کەس تەنانەت بارکیشم قسەیان لەدەم نەهاتە دەرە، منیش بەبیستنی ئەم قسەیە بەسەرسامیەکەوە سەیری باوکمم کردوو واقم وڕمابوو، ئەو هەروەکو هەمیشە ئارام و دەم بەپێکەنین لەسەر کورسیەکەی دانیشتبوو لەپاڵ ژنەجوانەکەیدا منیش لەولاوە برسی و پەرێشان لەگۆشەیەکدا راوەستابووم فەرامۆشی کردبووم، بیری نەدەکردەوە ئەو نۆکەرە کوڕی خۆیەتی.

پاش ئەوەی میوانەکان نانیان خوارد گشت دەوریەکانم کۆکردەوە، هاوردمەوە بۆ چێشتخانەکە لەوکاتەدا دەستم بەردیوارەکە کەوت، یەکێك لەدەوریەکان شکا، باوەژنەکەم کاتێك هاتە چێشتخانەکە، سەرنجیدا یەکێك لەدەوریەکان شکاوە خێرا سیخێك کەبابی هەڵگرت و بێ بەزەییانە بەتوندی کردی بەقۆڵمدا، لەتاو ئازارەکەی هاوارم کردوو لەگۆشەی چێشتخانەکەدا کەوتم بەزەویدا.

تەواوی قۆڵم نوقمبوو لەخوێندا، باوکیشم بەدەم هاوارەکەمەوە خۆی کرد بەژووردا و کاتێك منی بەوشێوەیە بینی پرسی چی بوو؟ لەوکاتەدا باوەژنەکەم دەستپێشخەری کردو بێئەوەی بهێڵێت قسەیەك بکەم بەتوڕەییەوە وتی: ئەتەوێت لەوە زیاتر چی ببێت، پاش ئەو هەموو قسەیە دەپرسیت چی بووە؟ نابینیت یەکێك لەقاپەکان شکاوە من لەبەیانیەوە لێرە نامێنم ئیتر ژیان لێرەدا بۆمن هیچ سودێکی نی یە، هەمیشە لەمماڵەدا کاردەکەم و زەحمەت دەکێشم ئەمەش پاداشتەکەمە چ گوناهێکم کردووە لەدەرگای خواوەندا منی هێناوەتە ئەم ماڵە تۆ منت بەت بەخت کردووە ئیتر ناتوانم لەم ماڵەدا بمێنم لەگەڵ تۆ و

کوڕەکەتدا ژیان بەسەر بەرم ئەمە چ ژیانێکە بۆ منت دروست کردوە
دوبارە باوکم پرسی:

مەگەر چی بووە ئەوەندە ناڕەحەتی ژنەکە؟ باوەژنەکەم قیژاندی و وتی: چاکتر وەهایە لەبێژەن بپرسیت چی رویداوە ئەو چەداوە رووە لەگەڵ من چەنەبازی دەکات و رادەبوێرێ یەکێ لە قاپە گرانەکانی شکاندووە بۆئەوەی تورەم بکات بەچاوی خۆم بینیم بەئەنقەست دەوریەکەی خستە خوارەوە و شکاندی، دەبێت نەهێڵیت بەسەریەوە بچێت، باوکم کاتێك باس و خواستەکەی بەوشێوەیە بینی هاتە پێشەوە و وتی بێژەن بۆچی وەهات کردووە منیش کەلەتاو ئازاری قۆڵم دەتلامەوە بەتوندی وتم باوەڕبکە لەخۆمەوە نەمشکاندووە بەدەستمەوە کەوتە خوارەوە باوەژنەکەم راوەستابوو گوێی لەقسەکانم دەگرت کاتێك بینی خەریکە راستیەکەی بۆباوکم رون دەکەمەوە و تێبگات من بەئەنقەست نەم شکاندووە باوەژنەکەم گریانێکی مەکراوی دەستپێکردو وتی:

بەخوا ئیتر یەکسەعات لەمماڵەدا نامێنم، هەرلەئێستاوە ئەم هەتیوە نەفامە تۆمەتی درۆ دەداتە پاڵم، هەر ئەمشەو دەڕۆم تۆ و کوڕەکەت بمێننەوە، ئێرە جێگەی من نی یە. باوکم سەرنجی دا گەر بیەوێت پشتیوانیم بکات ژنەکەی دەتۆرێت لەبەر ئەوەش ناچاربوو لایەنگیری ژنەکەی بگرێت، بۆ ئەوەی کۆتایی بەناخۆکیەکە بهێنێت و دڵی ژنەکەی ئاشت بکاتەوە وتی مریەم گیان بۆ لەخۆتەوە ئەگریت.

من بێژەن لەهەمووکەس باشتر ئەناسم باوك هەیە منداڵی خۆی نەناسێ من دەزانم چەند خراپ و ناکەس بەچەیەکە و بەئەنقەست شکاندویەتی، بەسەریەوە ناچێت. ئەمشەو لێفەکەی پێ بدە

بالەحەوشەکەدا بنوێت و تێبگات ئەگەر سەرپێچی بکات ئێمەش تۆڵەی لێدەکەینەوە.

باوەژنەکەشم چاوەڕێی شتێکی لەوجۆرەبوو بێ ڕاوەستان لێفە کۆنەیەك کەشەوانە دەمدا بەخۆمدا دای بەدەستمەوە و وتی: زوو بڕۆ ئەمشەو لەسەر بەفرەکەدا بخەوە تاتێبگەیت چەنەبازی چی یە من بەوحاڵەوە لێفەکەم گرت و چومە حەوشەکە، لەپەنا دیوارێکدا نیوەیم ڕاخست و نیوەکەی ترم دابەخۆمدا، پاش نیوسەعات میوانەکان ڕۆیشتن کاتێك باوکم و ژنەکەی خواحافیزیان لەمیوانەکان دەکرد گوێم لەدەنگیانەوەبوو باسی خراپەیان دەکردم، میوانەکان ڕۆیشتن باوکم دەرگاکەی داخست، بەتوڕەییەوە وتی ئابڕوی بردم بەخوا ئەم هەتیوە ژیانی چاك تاڵکردوین بەخوا هیچ ڕەحمم پێوەی نەماوە، ئاقڵی دەکەم و کاتێك باوکم نزیك بویەوە لەقادرمەکان بەدڵسۆزیەکەوە وتی:

مریەم زوو بچۆرە ژورەوە هەوا زۆرساردە لەوانەیە سەرمات ببێت پاش ئەمە هیچی ترم گوێ لێنەبوو لەو هەوا ساردەدا لەناو بەفردا بەبرسیەتی هەتا بەیانی خەوم لێ نەکەوت، نزیکەی بەرەبەیان بوو لەسەرمادا گشت گیانم ڕەق بوبو باوکم بانگی کردم و وتی:

بێژەن ئەگەر جارێکی تر چەنەبازی و بێ حەیایی بکەیت تۆڵەی قورسترم بۆدانـاوی بێگومان لەوکردارە ناشیاوەی ئەمشەو زۆر پەشیمانی بێ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵامی من بکات خێرا لەژورەکە چوە دەرەوە، ڕۆیشت بۆ فەرمانگە و باوەژنەکەشم لەکاتێکدا پێدەکەنی بانگی کردم بۆ ژورەکەی و وتی: بێژەن بەخوا لەدڵەوە خۆشم دەوێیت لەوانەیە باوەڕم پێنەکەیت بەڵام بزانە هەرگیز درۆ ناکەم تۆ ئەگەر تورەم نەکەیت هیچ کاتێك دوژمنایەتیت لەگەڵ ناکەم. چەندساتێك بیرم

لەقسەکانی دەکردەوەبەلام نەمزانی بۆچی ئەوەندە بەنەرمی قسەی لەگەڵ دەکردم.

لەو گۆڕانکاریە کتوپڕەی کردارو رەفتاری زۆر سەرسام بووم، پاشان دریژەی دا بەقسەکانی و وتی ئەمشەو بانگهێشت کراوین بۆ میوانی تۆش لەگەڵمان وەرە، ئەم بابەتە وایلیکردم زیاتر سەرسام ببم لەخۆمەوە شادیەکی منداڵانە لەدڵمدا پەیدا بوو وامزانی لەنێوان من و باوەژنەکەمدا رق و کینە نەماوەتەوە زۆر خۆشحاڵبووم، گەرچی حەزیشم لەمیوانی نەبوو بەلام لەبەر ئەوەی پەیڕەوی قسەکانی ئەو بکەم وتم باشە بەلام خۆمن جل و بەرگم نیە تالەگەڵتا بیم ئەویش بەبیستنی ئەم قسانە کەمێك روانیە سەروچاوم و وتی: راست دەکەیت بەلام گوێ مەدەرێ من چاکەت و پانتۆڵی براکەمت بەقەرز بۆدێنم ئەمشەو لەبەری بکە.

پاشان تەلەفونی کرد بۆ براکەی و باس و خواستەکەی بۆ باس کرد و کاتێك تەلەفونەکە کۆتایی پێهات باوەژنەکەم بانگی کردم بۆ ژورەکەی و وتی: من و باوکت کاتژمێر (٧) دەڕۆین تۆدەبێ لەماڵەوە بمێنیتەوە تا براکەم دەگەڕێتەوە جل وبەرگەکەی بهێنێ چونکە براکەم کاتژمێر (٧) لەسەر کار دەگەڕێتەوە تائەوکاتەی دەگەڕێتەوە و جل وبەرگەکانت بۆ دەهێنێ کاتژمێر دەبێت بە (٨) کەسێك دەنێرم بەشوێنتدا تابتهێنێت بۆلامان. پێڵاوەکانی باوکت بۆیاخ بکە و ئەمشەو لەپێ ی بکە دەبڕۆ خێرا کارەکانت ئەنجام بدە.

من خێرا چوم بۆ چێشتخانەکە و سەرگەرمی شۆردنی قاپەکانی دوێنێ شەو بووم نزیکەی سەعات (٦)ی ئێوارە بوو باوکم گەڕایەوە بۆ ماڵەوە من باوکم نەبینی لەبەرئەوەی لەنهۆمی دوەمدا سەرگەرمی

گسکدان بووم تەنها گویم لەقسەکانی بوو لەنهۆمی خوارەوە دەیگوت مریەم برۆ بەبیژەن بلێ ئێمە ئەمشەو لەمیواندارین درەنگ دەگەڕێینەوە، پاش چەند خولەکێك باوەژنەکەم هاتەلام و وتی:

بێژەن باوکت ناڕەزایە تۆ لەگەڵمان بێیت هۆکارەکەشی نازانم بەڵام تکام لێکرد بۆئەوەی تۆ لەگەڵمان بێیت بەڵام بەوشێوەیەی پێموتیت نەبێت چاوەڕێبیت تا کاتژمێر (٨) کەسێك دەنێرم بەشوێنتدا و پاشان بەخێرایی رۆی و لەگەڵ باوکمدا رۆشتنە دەرەوە باوەژنەکەم پاڵتۆیەکی چەرمی لەبەردابوو کلاوێکی رەشی کردبوە سەری پاش رۆیشتنی ئەمان سەرنجم دا لەدەرگاکە دەدەن خێرا دەرگاکەم کردەوە و لەسەر شۆستەی جادەکە کوڕێکی منداڵم بینی چاکەت و پانتۆلێکی بەدەستەوە بوو هەرکە منی بینی هاتە پێشەوە و چاکەت و پانتۆڵەکەی دابەدەستمەوە بەڕەفتارێکی منداڵانەوە وتی: ئەمانە هی براکەی مریەم خانە لەبەرئەوەی خۆی کاری هەبوو نەیتوانی بێت بۆ ئێرە پاشان خواحافیزی کرد و رۆیشت.

خێرا گەڕامەوە ماڵەوە و جلەکانم کردە بەرم سەرنجم دا رێك بەبەری خۆمە. سەعات نزیکەی (٨) بوو زەنگی دەرگاکە لێدرا و بەپەلە رۆیشتمە حەوشەکە و دەرگاکەم کردەوە، پیاوێکی درێژی چوارشانەم بینی روخسارێکی درێژکۆلە و ریشێکی درێژی پێوەبوو هاتە پێشەوە و وتی: باوکت ناردومی بۆئێرە تابتبەم بۆماڵی ئاغاکەم چون لەوێ میوان بەبێ ماتڵ بوون کەوتمە دوایی و کەوتمە رێ. جیمیش لەگەڵمدا لەماڵ هاتە دەر هەرچی هەوڵمدا بیکەمە، زۆرەوە هەر بۆم نەکرا.

چەند هەنگاوێك لەماڵەکە دورکەوتبوینەوە پیاوەکە لێی پرسیم چەندساڵیت؟ وەڵامم دایەوە (١٥) پانزە ساڵانم پێکەنینێکی کرد و وتی

باوەڕناکەم ( ١٥) ساڵان بیت وەکو منداڵێکی (١٢) ساڵان دەکەویتە بەرچاوم، بۆچی ئەوەندە لاوازیت؟بێدەنگ بووم هیچم نەووت بەناو کوڵانی باریك وتەنگدا زۆر رۆیشتین، هەوا بەتەواوی تارك بوو کزەیەکی سەرماش بەڕوماندا دەهات پاش ئەوەی ماوەیەکی دورو درێژمان بڕی پرسیارم کردماڵی ئاغاکەت زۆر دووره؟ کەمێك سەیری کردم و وتی ماندوو بویت وەڵامم دایەوە نەخێر بەڵام لەمێژەوە بەڕێوەین نزیکەی یەك سەعاتە بەڕێوەین. بەئارامی وتی: نیوسەعاتمان ماوە. لەوەڵامدا وتم:

لەوانەیە ماڵی ئاغاکەت لەدەرەوەی شاربن بەتوڕەییەوە وتی چاك وەهایە بێدەنگ بیت حەزم لەم جۆرە پرسیارانە نی یە، پاش ئەوە هیچم نەوت، پاش ماوەیەك گەیشتینە شوێنێکی دوور، هیچ خانویەك بەدی نەدەکرا تەنها لەدەورو پیشتمان درەختی روت و قوت نەبێ بەهۆی رەشەباوە لق و پۆپەکانی دەیانکێشا بەیەکدا و ترسی بۆمن دروست دەکرد، بەبێ هۆ لەترساندا دەلەرزیم زۆر بەنەرمی پرسیارم کرد ماڵی ئاغاکەت لەکوێیە لێرەدا هیچ خانویەکی لێ نی یە؟ دەستی گرتم و وتی ئەو خانوە دەبینی! دەستی بەرەو لقی درەختەکان درێژ کرد و شوێنێکی نادیاری پیشان دام، بەترسەوە وتم: کامەیە هیچ نابینم لەکاتێکدا زۆرتوڕە دەکەوتە بەرچاو وتی:

بۆچی درۆدەکەیت پاشان بەدەست ئاماژەی بەرەو خۆرئاواکرد و بەتوندی وتی سەیری ئێرەوە بکە ئەو درەختانە ئەو دەرگا ئاسنە گەورەیە کەبەسەریەوە گلۆپێك داگیرساوە چۆن نایبینی کەمێك هاتمە پێشەوە لەنێوان درەختەکانەوە سەیری ئەوجێگەیەم کرد کە ئەو ئاماژەی پێکردبوو کەمێك ووردبوومەوە پاشان سەرنجمدا راست دەکات،

خێرا وەڵامم دایەوە ئەڕێ بەچاکی دەیبینم، لەتەنیشت درەختەکانەوە دەرگایەکی ئاسنی سەوز دیارە و سەر دەرگاکە گڵۆپێکی بچوکی پێوەیە بەهۆی روناکی گڵۆپەکەوە ئەتوانی تەماشای بکەیت. بەدەنگێکی بەرز پێکەنی و وتی:

بەڵێ ئەوەماڵی ئاغاکەمە، باوکت و باوەژنەکەشت لەوێن من هەرکە وشەی باوەژنم لەدەمی ئەو بیست وەکو بزمار چەقیم بەجێگەکەی خۆمدا و کەوتمە بیرکردنەو، لەکوێ ئەزانێ باوەژنم هەیە؟ بەڵام هەرگیز ئەوتوانایەم لەخۆمدا نەدەبینی پرسیاری لێ بکەم ماوەیەك درێژەی دا تا گەیشتینە ئەوجێیە ئەو پیاوەی رێنیشاندەرم بوو دوو مشتی قایمی لەدەرگاکە داو خێرا دەرگاکە کرایەوە پیرەژنێکی سەرسپی بەڕوخسارێکی چرچو لۆچەوە لەبەرامبەرمان بەدەرکەوت من و پیاوەکە چوینە ماڵەوە جیمیسش لەگەڵمان هات بێ ئەوەی ئەوپیاوە ئاگای لێبێ جیمیسش هاتوەتە ژورەوە هەرکە پێمان خستە ژورەوە یەکسەر باخێکی گەورەم بینی لەتاو تاریکی چاو چاوی نەدەبینی بەباشی نەمدەتوانی شوێنێك دەستنیشان بکەم، بەترس و لەرزێکەوە پرسیم کوا ئەو میوانداریەی دەتگوت خۆکەسێك دیار نییە؟ مشتێکی دابەدەممدا و وتی ئەوەندە قسەی زیادە مەکە و حەزم لەچەنەبازی نیە، پاشان دامیە دەستی پیرەژنەکەوە لێرەدا زانیم کەوتمە داوێکی ترسناکەوە کە رەنگە هەرگیز دەربازی نەبم بەوسادەیە فریوم خوارد و بەپێی خۆم هاتم بەرەو داوەکە زۆر پەرێشسان بووم لەترسانا قسەم بۆنەدەکرا، بەئارامی لە پیرەژنەکەم پرسی بۆچی منتان هێناوە بۆ ئێرە؟

ئەویش بێ ئەوەی گوێ لەقسەکانم بگرێ دەستی گرتم و بەدوای خۆیدا رایکێشام بەناچاری کەوتمە دوای، ئەو دڕندانە لەتاریکیدا وەك

خێـو دەهاتنـە پـێش چـاو، بڕیـارم دا رابکـەم لەخانویـەکی دوردا ئاشکرانەبوو بەنیازن چ بەڵایەك بەسەرم بهێنن هەموو شوێنێك تاریك بوو جارە جارە دەنگی کونەبەبو و قشقەلە دەهاتە بەرگوێم روخسارە دۆزەخیەکـەی پیرەژنـیش زیـاتر تـرس و لـەرزی بۆدروسـت دەکـردم، روخساری زۆر ناشیرین بوو دەستمی بە دەستە وشکەکانی دەگوشی چـاوەکانی وەکـو چـاوی کونـە بـەبو لەتاریکیـدا دەدرەوشـایەوە و روخساری هەموو چرچ و لۆچ بوو جلێکی درێـژی رەشی لەبەردابوو کەمێکیش کەمەری چەماوە بوو روخساری وەك جەلادێك وابوو منـی بەدەستەوە بێت، بەرەو مەرگم بەرێت بڕیارم دا رابکەم بەپەلە دەستم لەنێو دەستە لاوازەکانی دەرهێنا و بەڵام پێش ئەوەی دەست بەڕاکردن بکـەم پـاڵێکی تونـدم پێـوە نـرا گەڕامـەوە دواوە، پیـاوێکم بینـی بـەڵام بـەهۆی تاریکیەکەیـەوە نـەمزانی بەدوامەوەیـە، وازم لـەڕاکردن هێنـا پیرەژنەکە منی بەڕێڕەوێکی دورو درێـژدا راکێشا لـەکۆتایی ڕێڕەوەکە ژورێکـی بـچکۆلانەبوو منـی نزیـك کـردەوە لـەوێ و دەسـتی کـرد بـە گیرفانیدا و کلیلێکی دەرهێنا، بەهێواشی دەرگاکەی کردەوە و بەپاڵ منی کردە ژورەوە و پاشان بەپەلە دەرگاکەی بەست.

ئەوەندە تارك بوو نەمدەواتی هیچ شوێنێك دیاری بکەم ترس و لەرز لەلایەك و تـاریکیش لەلایـەکی تـر ئازاریـان ئـەدام نەمدەزانی چی بکـەم پاش چەندخولەکێك چاوەکانم بەتاریکی راهات سەرنجمدا جیمیسشم لەگەڵدایـە و کـەمێکیش ئـارام بوومـەوە چـون ئـەو ئاژەڵـە بـێ ئـازارە و بەوەفایـە وەکـو هاوڕێیـەك بوو بۆم بۆ هەرشوێنێك بڕۆیشتمایە لەگـەڵم بوو هەروەك چۆن لەم هەلومەرجە دژوارە لەگەڵمدایە هەرگیز نەیهێشتوە تـەنها بم بـەڵام هەرچۆنێك بێت مـەرگی هـەردوکمان گومـانی تێدا نـەبوو

چون بەکەوشتنی من جیمیش یش دەکوژن کەمێك سەیری دەوروبەرم کرد بۆ ئەوەی ڕێگەی دەوروبەر بدۆزمەوە بەڵام ئەوانەی منیان زیندان کردووە هەموولایەکیان تەنیوەتەوە بچوکترین ڕێگەی دەربازبونیان نەهێشتوەتەوە.

سەیری هەرشوێنێکم دەکرد هیچم نەدەبینی تەنها لەگۆشەیەکی دیوارەکەوە نەبێت روناکییەکی بچوکم بینی و بەپەلە بەرەو روی رۆیشتم سەرنجمدا پەنجەرەیەکی بچوکە و دەرەوەی لێوە دیارە لەناو ژورەکەشدا مێزێکی کۆنەی بچوکی لێبوو بێجگە لەو مێزە هیچی تر لەژورەکەدا نەبوو نازانم هەستی خۆم لەو چرکەساتەدا چۆن دەربڕم تابەرەبەیان خەوم لێ نەدەکەوت وەکو دێوانەیەکی سەرگەردان لەناو ژورەکەدا دەهاتم و دەچووم هەندێ جاریش لەخۆمەوە دەمکێشا بەدیوارەکەدانەمدەزانی بۆچی وادەکەم لەوانەشە شێت بووبووم.

تاریکی شەو سات لەدوای سات زیادی دەکرد، گوێم لەدەنگی هیچ شتێکەوە نەدەبوو تەنانەت دەنگی لقوپۆپی دەختەکانیش تەنها جارجارێك نەبێ گوێم لەدەنگی قاچی جیمی دەبوو لەناو ژورەکەدا دەهات و دەچوو ئەمەش لەخۆیەوە ترسی لەلا دروست کردبووم چونکە لەبچوکترین دەنگ دەترسام، ئەو تاریکە شەوەش وەکو خۆرە هەموو لەشمی دەخوارد، نەمدەزانی چیبکەم وەکو باڵندەیەکی ئەسیری نێو دەستانی مرۆڤێکی بەهێزم لێهاتبوو، دڵم ئەوەندە بەپەلە لێی ئەدا زۆر بەئاسانی گوێم لەدەنگی دڵم بوو تەنها دەمویست ڕێگای دەربازبوون بدۆزمەوە بەڵام هیچ ڕێگایەك نەبوو ئارامیشم نەدەگرد وەکو کەناریەکی ناوقەفەسم لێهاتبوو بۆ دەرباز بوون، ئەملاو ئەولام دەکرد لەکۆتایدا بڕیارم دا ئەوپەنجەرە بچوکە بکەمەوە ، لەوێشەوە خۆم فڕێ بدەمە

دەرەوە بەڵام کاتێك چومە پێشەوە دەستم نەگەیشتێ ئەوەندە بەرز بوو خێرا مێزەکەم هەڵگرت و خستمە ژێر پەنجەرەکەوە هەرکەویستم بڕۆمە سەر مێزەکە لەناکاو یەکێك لەقاچەکانی شکاو مێزەکە کەوت و دەنگێکی ترسناکی لێوەهات منیش کەوتمە خوارەوە و ئازارێکی زۆر بەقاچم گەیشت، لەوکاتەدا ترس و دڵەڕاوکێم بوو بەدوو ئەوەندە نەمدەزانی چیبکەم ناچار چومە گۆشەیەك تاکاتی بەرەبەیان.

سەرنجم دا یەکێك خەریکی کردنەوەی دەرگاکەیە بەپەلە مێزەکەم هەڵگرت و جیمیم لەپشتەوە شاردەوە پاشان دەرگاکە کرایەوە پیرەژنەکە بەو روخسارە ترسناکەیەوە لەدەرگاکە دەرکەوت زۆر بەئارامی چومە پێشەوە کاتێك بینی بەرەو روی دێم وایدەزانی دەمەوێت رابکەم لەبەر ئەوەیش جلو بەرگە درێژەکەی بەری هەڵکرد و گەڕایەوە دواوە و هاوارم کرد:

نامەوێت رابکەم تەنها دەمەوێت بزانم بۆچی و لەبەر چ هۆیەك زیندانتان کردووم کاتێك ویستم زیاتر بڕۆمە پێشەوە سەرنجم دا جیمی لەپشت مێزەکە هاتوەتە دەرەوە و دەیەوێت شوێنم بکەوێت بەپەلە گەڕامەوە دواوە دەرگاکەشم داخست، پیرەژنەکەش دەرگاکەی بەکلیل داخست و دورکەوتەوە، بەزەحمەتێکی زۆر قاچی مێزەکەم لکاندەوە بەمێزەکەوە بەڵام لەبەر ئەوەی پواو بوو نەمدەتوانی دڵنیابم بەکەڵك دێت یان نە؟ بەهێواشی خستمە ژێر پەنجەرەکە ویستم قاچمی بخەمە سەر مێزەکە خزا، خێرا قاچم لابرد لەسەری ، دوبارە مێزەکەم جێبەجێ کرد و لکاندم بەدیوارەکەوە پاشان بەئارامی چومە سەری و چومە لای پەنجەرەکە دڵم کەمێك ئارام بویەوە خێرا دەستم کرد بەکردنەوەی پەنجەرەکە، بەڵام نەکرایەوە.

بەهەموو هێزێکەوە پەنجەرەکەم بەرەو روی خۆمەوە راکێشا بەلام هەوڵەکەم بێ ئاکام بوو، لەوکاتەدا چاوم کەوت بەدەرەوە باخێکی گەورە و بێ پایانم بینی زەوی سپی پۆش بوو لەبەفر ئاشکرابوو بەفرێکی زۆر باریوە و لقی درەختەکان بەبەفر داپۆشرابوو، جۆگەلەیەك ئاو بەبەردەم پەنجەرەکەدا تێدەپەڕی نەمدەزانی ئاوەکەی بەرەو کوێ دەڕوات تەنها توانیم دەرگای باخەکە بەجوانی ببینم هەرئەوکاتەی سەیری دەرەوەم دەکرد لەبەر ماندوی و بێ خەوی خۆمم پێ رانەگیراو بەسەردا کەوتمە خوارەوە، زرمەیەکی گەورەم لێوەهات هەرلەوکاتەشدا سەرنجمدا کەسێك سەرگەرمی کردنەوەی دەرگاکەیە دووربارە جیمیم لەپشت مێزەکەدا شاردەوە دەرگاکە کرایەوە پیرەژن بەهەمان روخساری ناشیرین و ناپەسەندیەوە هاتە ژورەوە لەرق و کینندا دەلەرزی وتی: چی دەکەیت؟ بۆچی ئەوەندە زرمە زرم دەکەیت بەپاڕاندنەوە وتم:

بۆخاتری خوا رەحمم پێبکەن و رزگارم بکەن لێرە خۆ بێگوناهم بۆچی منتان هێناوە بۆئێرە؟ کاتێك ویستی بڕوات بەپەلە دامێنی کراسە رەشە درێژەکەیم گرت بۆئەوەی نەهێڵم بڕوات بەپەلە دەستی هێنایە پێشەوە بۆئەوەی کراسەکەی لەچنگم دەربهێنێ لەم کێشمە کێشەدا کراسەکەی بەرز بووەوە، قاچەکانیم بینی سەیری قاچەکانیم کرد پەنجەیان پێوە نەبوو وادەهاتە بەرچاوم لەڕوداوێکدا پەنجەکانی قاچی لەدەست دابێت، کراسەکەیم بەرداو بەم کارەش زۆرنارەحەت بوو مشتێکی قایمی دا لەسەر سینگم و وتی: برۆ وونبە لەبەر چاوم هەتیو پاشان چوە دەرەوە ویستم بەشوێنیدا برۆم، دیسانەوە جیمی لەپشت مێزەکەوە هاتەوە دەرەوە بۆئەوەی شوێنم کەوێت ناچاربووم بگەڕێمەوە دواوە کاتێك پیرەژن دەیویست دەرگاکە دابخات بەدەنگێکی بەرز وتی:

فکری راکردن لەسەرت دەربکە و ئێمەش ئەوەندە ناڕەحەت مەکە هاوارم کرد دەی تاکەی دەبێت لێرە بمێنم؟ وەڵامی دایەوە تا پاش نیوەڕۆ، یەکسەر بەبیستنی ئەم قسەیە هەموو لەشم دەستی کردبە لەرزین و نەمتوانی بەپێوە رابوەستم، لەخۆمەوە هاوارێکم کرد و کەوتم بەزەویدا تاچەند خولەکێك وەکو شێتم لێهات، پاش ئەوەی کەمێك ئارام بوومەوە دیسانەوە بڕیارم دا لەهەمان پەنجەرەوە کەڵك وەربگرم بەڵام هەرچی هەوڵمدا پەنجەرەکە نەکرایەوە بیرم کردەوە چاکتر وایە شوشەکە بشکێنم بەڵام بۆبەتبەختی هیچ شتێك نەبوو پەنجەرەکەی پێ بشکێنم سەرەنجام مشتێکی توندم لێداو شوشەکەم شکاند، سەرنجی دەستم دا دەستم پڕ لە خوێنە بەپەلە هاتمە خوارەوە چون هیچ شتێك نەبوو دەستی پێ ببەستم بۆئەوەی خوێنی لێ نەڕوات ناچار بەرگی چاکەتەکەم دڕاندوو بەتوندی ئاڵاندم بەدەستمەوە، پاشان سەرنجمدا گوێم لەدەنگی قاچێکە لە ڕاڕەوەکەدا، نەمدەزانی چی بکەم خۆم گەیاندە کەناری دیوارەکە دەنگی قاچی نزیکتر دەبویەوە ئەگەر منی لەوبارودۆخەدا ببینیایە بێگومان تاکە ڕێگەی دەرباز بوونم لەدەست دەچوو پاشان دەنگەکە بەتەواوی نەما، دیسانەوە ویستم بچمەوە لای پەنجەرەکە دیسانەوە دەنگی قاچەکە هاتەوە بەرگوێم لەجێگەکەی خۆمدا راوەستام و نقەم لەخۆم بڕی تا دەنگی قاچەکە دوورکەوتەوە.

خۆم نزیك کردەوە لە پەنجەرەکە و ووردە شوشەکانیشم کۆکردەوە، پاشان ویستم خۆم هەڵبدەمە خوارەوە سەرنجم دا زۆر هەڵەم چونکە پەنجەرەکە زۆر بچوك بوو پێیدا نەدەچوم، ئەمجارەیان مەرگی خۆمم بەچاوی خۆم بینی لەداخاندا چەندجارێك دەستە لاوازو باریکەکانی

خۆم کێشام بەدیوارەکەدا تابتوانم تێکی بدەم بەڵام نەک هەر سودی نەبوو دەستەکانیشم ئازاریان پێگەیشت و کوتران.

دەرگای باخەکە بەجوانی دیاربوو، جۆگەلەیەک ئاویشم چاوپێکەوت گەر بمتوانیایە لەوژورە دەرچومایە بەشوێن ئاوەکەدا خۆمم دەرباز دەکرد مەرگ بەیداخی بەسەرمەوە هەڵدابوو لەوساتانەدا هەستم دەکرد ژیان بەلامەوە زۆر خۆشە، بەڕاستی ئەی تەمەن تۆ زۆر ئازیزیت لەوساتەوەی لەدایک دەبین تا ئەوساتەی دەمرین هەموومان بەتەمای ژیانین، لەسەرەتای لەدایک بوندا بێ ئەوەی هیچ بزانین هەر حەز لەژیان دەکەین و یەکەمین ژیانیشمان هەر گریانە لەکۆتایدا بەدڵێکی پەژارەوە لەسەر مێزەکەوە خۆم فڕێدایە خوارەوە بەنائومێدیەکەوە سەیرێکی جیمیم کرد و بەهۆی ئەویشەوە کەوتمەوە بیری دەرباز بوون خێرا دەفتەرە بچوکەکەی گیرفانم و قەڵەمێکم دەرهێنا و سەیرێکی دەفتەرەکەم کرد حساباتی کڕینیماڵەوەبوو بەپەلە پەڕەیەکم لێکردەوە و دەستم کرد بەنوسین:

باوکە من بەندکراوی دەستی پیاو کوژەکانم گیانم لەمەترسیدایە رەنگە ئەگەر کەمێک درەنگ بگەیتە فریام بمکوژن، نیشانەکانی ئەوباخەم بەجوانی بۆ نوسی و پاڵتۆکەم دڕاند و نامەکەم پێ ئالاند بەدەوری ملی جیمیدا و بەهێواشی لەپەنجەرەکەوە جیمیم خستە خوارەوە بەڵام جیمی راوەستاو سەرگەرمی پاس کردنم بوو.

خێرا وردە شوشەکانی‌دەورو پشتی خۆمم بۆ هاویشت و چەند هەنگاوێک رۆیشت بەردەوام بووم لەوکارە تا نزیک بویەوە لە دەرگای باخچەکە و پاشان کەمێک سەیری چواردەوری کرد و دیسانەوە ویستی بێتەوە بۆلام و پارچە شوشەیەکم بۆ هاویشت کاتێک ئەمەی بینی

لەکونێکـەوە ڕۆیـشتە دەرەوە، ئەنـدەکێ ڕاوەسـتام نـەوەك بگەڕێتـەوە کاتێك بینیم نەگەڕایەوە لەسەر مێزەکە هاتمە خوارەوە دڵم کەمێك هێور بویەوە بەڵام هێشتا بەتەواوی ئومێدەوار بەژیان نەبووم.

جیمی ڕۆیشت و دڵنیا نەبووم چی رودەدات ئەگەر بیتوانایایە خۆی بگەیەنێتە ماڵەوە ئەوا دەربازبوونم گومانی تێدا نەدەبوو، دووسەعات تێپـەڕی و هـیچ هـەواڵێك نـەبوو ئەوەنـدەی نـەمابوو بـۆ نیـوەڕۆ سات لـەدوای سات لەمەرگ نزیکتر دەبوومەوە ماوەیـەك تێپـەڕی سـەرنجم دا کەسێك بەپەلە دەرگاکە دەکاتەوە خۆم گەیاندە کەناری دیواری ژورەکە، دەرگاکە کرایەوە، پیاوێك بەتوڕەییەوە خۆی کرد بەژوردا هەرکە منی بینی خێرا بـەرەو رووم هـات و لەخۆیـەوە مـشتێکی تونـدی دالەسـنگم، دەستەکانمی برد بۆ پشتمەوە و پەتێکی گەورەی لەگیرفانی دەرهێنا و ئالاندی بەدەستمدا، بەزەحمەتێکی زۆر خۆمم لـەژێر چنگیدا دەرهێنا و بەرەو دەرگاکە رام کرد بەڵام بە هەڵمەتێك گرتمیەوە، ویستی لەژورەکە دورم بخاتـەوە پیرەژنـە روخـسار ناشـیرین و چڵکنەکە بەهێواشـی هاتـە پێشەوە و وتـی پـۆلیس سـەرگەرمی پشکنینن، چاکتر وایـە لێرە دوری بخەینـەوە، دڵنیـابووم جیمـی گەیـشتوەتە ماڵـەوە و باوکیـشم بـۆ دەربـازبوونم هـەموو زانیاریـەکانی داوەتـە پـۆلیس بـەڵام بەوشـێوازەی ئەمان لەبەرچاویان گرتبوو دەربازبوونم مسۆگەر نەبوو، پیاوەکە بەپەلـە لەدەرگایەکی شاراوەی ڕێڕەوەکەدا بەرەو باخێکی تری بردم و دەستی بەڕاکردن کرد و منی بەدوای خۆیدا ڕاکێشا.

سـەرەتا بـەرگریم دەکـرد نەمـدەهێڵا بمبـات بەڵام بەچاکی دەمزانـی کێـشمەکێش لەگـەڵ پیـاوێکی زەبـەلاحی وەهـادا سـەرەنجامەکەی بەدۆڕاندنم کۆتایی دێت، مشتێکی بەهێزی دا لەچەناکەم دوبارە بەدوای

خۆیدا رایکێشام لەوساتەدا فیلێکم بەبیردا هات، بەهەموو هێزێکمەوە قیژاندم گەرچی بەتوندی دەمیشی گرتم پۆلیسەکان گوێبیستی هاوارەکەم بوون، بەپەلە بەرەو لامان رایان کرد و پیاوەکەش هەر ئەمەی بینی کردمیە باوەش و لەدەرگای باخەکەوە چوە دەرەوە، خستمیە ناو ئۆتۆمبیلێکی رەش کەلەقەراخ شەقامەکەدا بوو، ویستی ئۆتۆمبیلەکە ئیش پێبکات دەست بەجێ پۆلیسەکان فریاکەوتن و دەستگیریان کرد یەکێك لە پۆلیسەکان منیان لە ئۆتۆمبیلەکە داگرت و پەتەکەی دەستمی کردەوە و پیاوەکەی تریشیان دەستگیر کرد پاشان لەگەڵ دووپۆلیس دا چوینەوە ناوباخچەکە لەوێدا جیمی و باوکمم بینی لەگەڵ دووپۆلیسدا بە ئارمی پۆلیسیەوە راوەستابوون یەکێك لەو دووپۆلیسە دەمانجەیەکی بچوکی بەدەستەوەبوو.

باوکم بەئارامی و بەشێوازێکی خەیاڵاویەوە چاوی بڕیبوە درەختێکی کورت کە لق و پۆپەکانی بەفرێکی زۆری پێوەبوو، لەنیگاکەیدا نەسۆز دیاربوو نە رق و کین، وات دەزانی هەر لەم جیهانەدا نیە زۆر سارد و سڕبوو هەر سەیری منی نەدەکرد و سەیری شوێنێکی نادیاری دەکرد ئاشکرانەبوو بیری لەچی دەکردەوە، یەکێك لەپۆلیسەکان دامیەوە بەدەست باوکم، باوکم بۆ ئەوەی قسەیەکم لەگەڵ بکات کەوتەڕێ و منیش بەدوایدا کەوتمە ڕێ جیمیش بەشوێنماندا رایدەکرد بۆنی قاچمی دەکرد و سەری خستە سەر قاچەکانم و سەری رادەوەشاند، بەڵام باوکم هەر دەڕۆیی بۆ ئەوەی ساتێك سەیری دواوە بکات و قسەیەك لەگەڵ ئەوکوڕەیدا بکات کەلەلێواری مەرگ گەڕاوەتەوە بەڵام ئەو ئاژەڵە بەستەزمانە تائەوجێگەیەی لەتوانایدا بوو سۆزو خۆشەویستی نیشان دام.

باوکم، ئەوکەسەی ساڵانێکی زۆر زەحمەتی کێشاو ڕۆژانێکی زۆر شەریکی پەژارە و شادیەکانم بوو کاتێك دەگریام دەستی بەزەیی و نەوازشی بەسەرمدا دەهێنا و خۆشەویستی پێ دەبەخشیم، کاتێکیش پێدەکەنیم ئەویش پێدەکەنی و لەخۆشی پێکەنینیەکەی من شادی دەگێڕا، بەڵام ئێستا وەك پەیکەرێکی ساردو سڕ وەهایە و بون و نەبوونی من بەلایەوە گرنگ نیە، ئۆه، مرۆڤ چ بونەوەرێکی سەرسامە هەرگیز ناتوانێ ئەم بونەوەرە کە خۆی بەپادشای بونەوەرەکانی تر دەزانێ بەباشی بناسی، دەرباز بووم بەڵام سودی چیە دڵێك نەبێ بۆم دابخورپێ، لەگەڵ باوکمدا ڕۆیشتمەوە بۆ ماڵ بەڵام ئەوێ وەکو گۆڕستانێکی وشك و خامۆش وابوو لەلام، ئەو زادگایەی تێیدا لەدایك بووم تەنانەت دیوار و بەردەکانی منیان دەناسی، منیان لەبیربوو هەرگۆشەیەکی بیرەوەریەکی منی لەلابوو ئێستا وەك گڕی دۆزەخی لێهاتوە و ڕێی دەربازبونیشم نیە.

ڕۆژی دوایی پۆلیسێك هات بەدوای باوەژنەکەمدا بۆ ئەوەی ببیات بۆ کەلانتەری (مرکز) بەڵام باوکیشم لەگەڵی ڕۆیشت نازانم چەندی پارە پێدان ئیتر نەهاتنەوە بەدوای باوەژنەکەمدا، لەوڕۆژە بەدواوە زۆر لەڕادەبەدەر جیمیم خۆش دەویست چونکە تەنها ئەو دەربازکەری ژیانم بوو، بۆم ڕون بویەوە چۆن دەربازی کردووم کاتێك جیمی لەباخچەکە دێتە دەرەوە ڕاستەوخۆ بەرەو ماڵ دەکەوێتە ڕێ لەناوڕێگادا کاتێك خەڵکی بەوجۆرە دەیبینن سەرسام دەبن و منداڵە هاروهاجەکانیش بەردبارانی دەکەن بەڵام جیمی هەستی بەبۆنی مەرگ و دژواری کردبووم دەیزانی مەرگی من نزیك بوەتەوە، ڕاناوەستێ و هەر بەردەوام دەبێت و بەپەلە خۆی دەکات بەماڵدا، لەوکاتەشدا باوکم

لەفەرمانگـە دەگەڕێتـەوە کاتێـك جیمـی بەوشـپرزییە دەبینێـت خێرا پەتەکەی ملی جیمی دەکاتـەوە و چاوی بەنامەکـە دەکـەوێت و دەست بەجێ کەلانتـەری سـەر ڕێگەکـە ئاگـادار دەکاتـەوە وبۆ ڕزگـارکردنی من لەگەڵ جیمی و چەند پۆلیسێکدا بەڕێ دەکەون، بەهۆی ئەوانەوە ڕزگارم بوو.

ئەو چەند کەسە پیاوکوژەش باندێکیان دروست کردبوو بەبڕێك پارە کەسـانی بێتاوانیـان دەکوشـت و کەوتنـە داوی پۆلیسـەوە و سەرۆکەکەیان دواتر لەسێدارە درا، لەوڕۆژە بەدواوە باوکم و باوەژنەکەم قسەیان لەگەڵم نەدەکرد.

هەموو مرۆڤێك تادەمرێت پێویستی بەخۆشەویستی هەیە و ڕۆحی هـەموو کەسـێك تینـوی خۆشەویـستیە و تەنانـەت حـەزیش دەکـەین لـەدوای مردنمـان خـەڵکی فرمێسکمان بۆ بڕێـژن، کەواتـە دەتـوانم بڵێم لـەپاش مـەرگیش پێویـستمان بەخۆشەویـستی هەیـە بـەڵام سروشـت هەنـدێك لەسـۆزو خۆشەویـستی بێبـەش دەکـات لەکاتێکـدا هـیچ گوناهێکیان نییە ئەوانەی بێ گوناهن بێ هیچ هۆکارێك تاوانبار دەکرێن و سزا دەدرێن، هەرگیز ناتوانی بەزەیت بێتـەوە بەوسروشتەدا، جەورو ستەمی بـێ سـنور تـاوانی بـێ ئەنـدازە و جوانیەکانیـشی بـێ پایانن. ڕۆژێك بێ ئەوەی بمانەوێت لـەدایك ئەبین و زەمانـەش بەهێوری بەرەو پێـشمان دەبـات، هـەروەها بەشـوێن زەمانـەدا بـەرەو پـێش دەڕۆیـن، سەرنویـشتیش هەرچـۆنێك بیـەوێت لەگەڵمانـدا ڕەفتـار دەکـات، سروشـتیش تابتوانێـت ئەوانـە ئـەکوتێت کـەلاوازن، هـیچ کـەس نازانێ بۆچی لەدایك دەبێت بۆچی دەمرێت، بەنەزانی دەژیـن و پێشمان وایە بەهەموو شتێکی ئەم جیهانەمان زانیوە،

هـەمووومان لەبەرامبـەر ئـەم سروشـتە زەبەلاحـەدا لاواز و هیـچین لەبەرامبەر مردندا بێ دەسەڵات و داماو لەچەرخی ژیاندا بێ بەزەیی و خۆپەرست، لەبەرامبەر سەرنویشت بێدەنگ و کز بەبێ هۆ ڕۆژێك لەدایك دەبین بێ ئەوەی داوای لەش و گیانمان کردبێت، پاشان زەمانە بەپەلە و دەست و برد بەرەو نابوتی و نەبڕاوەیی راپێچمان دەکات، دیسانەوە بۆ هەمان جیهانی نادیاری پێش لـەدایك بـوون دەگەڕێینـەوە هەرچـەندە حەزیشمان لەجیهانی نەبوون نیە بەڵام بەزۆر ناچارین لەبەرامبەر مەرگ دا ئەوشـتانەی ڕۆژێـك بـەبێ هـۆ و بـەبێ ئاگـاداری خۆمـان پێمـان بەخـشراوە بیگێڕینـەوە، بـەڵام چـی ئـەکرێت پێویـستە لەبەرامبـەر سەرنویشتدا بێدەنگ بین جگە لەمەش هیچ چارەیەکی تر نیە منیش ناچارم لەبەرامبەر بێ عەدالەتیەکانی ئەم سروشتە بێدەنگ بم.

هەفتەیەك تێپەڕی باوکم و باوەژنەکەم بێ بایەخ سەیریان دەکردم و قسەیان لەگەڵ نەدەکردم تـا ڕۆژێکیان ئێوارە لـەبازاڕ گەڕامەوە لـەناکاو پەیکەری جیمیم بینی لەپشت حەوشەکەدا لەفەرعی قەراخ جادەکە هـەر ئەوساتە شکم لە باوەژنەکەم بو کـە کوشتبێتی بێ ئەوەی ئاگام لـەخۆم بێت هەرچی بەدەستمەوە بوو پژاندم بەزەویدا و بەرەو جیمی رامکرد، دەسـتە لەرزۆکـەکانم بـرد بۆسـەری، نەمـدەزانی چـی بکـەم هـەموو روخـسارم بەفرمێـسك تـەڕبوو، زۆر بـەئازاسی چـەندجارێك بـانگم کـرد جیمـی، جیمـی لـەناکاو بەبیـستنی دەنگـی مـن چـاوەکانی کـردەوە و چەندجارێك بەکزی و بێ تینیەکەوە سـەیری کـردم، پاشـان چاوەکانی نوقاند دوبارە بانگم کردەوە بەڵام چاوەکانی هـەر نـەکردەوە هـاوارم کـرد گریـام هـەر چـاوەکانی نوقـاوبوو، بەپەلـە خـۆمم گەیانـدە ماڵـەوە و راسـتەوخۆ چـومە ژوری باوەژنەکـەم، لەناوەڕاسـتی ژورەکـەدا بـوو

خەریکی خۆگۆڕین بوو تەنها ژێرکراسێکی تەنکی لەبەردابوو بەتوڕییەوە وەکو شێت قیژاندم بۆچی جیمیت کوشت؟ کاتێک منی بەو شێوازەی و شێواویەوە بینی بەپەلە هاتە پێشەوە و شەپازلەیەکی گەورەی کێشا بەبن گوێم دا و وتی:

تۆ چۆن لەخۆتەوە خۆت دەکەیت بەژوری مندا خۆ نازانی سەرگەرمی خۆگۆڕینم ماوەیەکە دەتبینم لەگۆشەو و کەنارەوە سەرنجی هەڵسوکەوتی من دەدەیت تا لەشی روتی منت بینی، ئێستا چارەت دەکەم لەم ماڵەدا یان دەبێت تۆبیت یان من، دوێنێش کاتێک خەریکی حەمام کردن بووم هاتیت و لەکونی دەرگاکەوە سەیری منت دەکرد لەوکاتەدا باوکم هاتەوە کاتێک بارودۆخەکەی بەوشێوەیە بینی وتی مریەم تورە مەبە بڕۆرە ژورەوە ئێستا چاری دەکەم.

باوەژنەکەم خێرا چوە ژورەوە باوکم هاتە پێشەوە بێ ئەوەی سەیرم بکات هاواری کرد بڕۆ ونبە لەبەرچاوم لەماڵەکەم بچۆرە دەرەوە، ئیتر ئێرە شوێنی تۆنیە بڕۆرە دەرەوە لەبەرچاوم دوربکەورەوە، بڕۆ ئیتر نەگەڕێیتەوە، بەئارامیەکەوە وتم باوکەگیان چۆن کوڕی خۆت دەردەکەیت.

بەدەنگێکی بەرز دوجار هاواری کرد ناپاکی خوێڕی پێم نەنگە کوڕی وەک تۆم هەبێت تۆ بونەوەرێکی بێ نرخی شەرەفی من لەکەدار دەکەیت،ەڵامم دایەوە باوکە من هیچ هەڵەیەکم نەکردووە باوەڕبکە پاک و بێتاوانم ئەو بەتوڕەییەکەوە وتی بێدەنگ بە زۆڵی درۆزن تۆ بێژەنەکەی ئەوسا نیت ئەخلاق و رەفتارت گۆڕاوە، وتم وا نیە باوکە گیان سەیر بکە لەماڵی باوکی خۆمدا نۆکەریم پێ دەکرێت دەستی گرتم و لەماڵ کردمیە دەرەوە، هاوارم کرد باوکە تۆم زۆرخۆش دەوێت و هەرگیز لێرە ناڕۆم

خۆنێره زادگەی منەو لێرەدا لەدایك بووم باوكە تۆدەتەوێت من لەشوێنێك بكەیتە دەرەوە تانو پۆمی پێوە بەندە كاتێك سەرنجی دا دەست بەردار نابم بەئارامیەكەوە وتی بێژەن تۆ هەتیوێكی هەڵە و هەرزە و بێ ئابڕوویت هێشتا منداڵیت كاری وادەكەیت قوڕ بەسەرم ئەگەر گەورە بیت چیتر دەكەیت؟ من منداڵی وەكو تۆ ناپاك و بێ ئابڕووم نیە، بەگریانەوە وتم باوكە لەبیرت نەچێت من منداڵی تۆم خوێنی تۆ لەڕەگەكانی مندا هاتوچۆ دەكات ئەگەر ئەمشە و لەم بەفرەدا دەرم بكەیت بەیانی لەشی بێ گیانم لەسەر شەقامەكەدا دەبینیتەوە، باوكە یارمەتیم بدە جگە لەتۆ هیچ كەس جێگام ناكاتەوە، وەڵامی دایەوە شایانی مردنی پێویستە بمریت بۆئەوەی ئەو لەكە نەنگە لەدامێنم پاك بێتەوە، سزای هەر مردنە ئەوكوڕەی شەرەف و ناموسی باوكی لەكەدار بكات، كاتێك ویستی دەرگاكە بەڕومدا دابخات دەستم گیركرد بە دەرگاكە ویستم بەزەیی پێمدا بێتەوە و بچمەوە ژورەوە بەڵام باوكم بەزەیی لەدڵدا نەمابوو، بەپەلە دەرگاكەی بەڕومدا داخست و لەتاودا دەستم كرد بە هاوار و گریان، وتم:

باوكە دەڕۆم و ئیتر ناگەڕێمەوە لەوانەشە لەبرسا بمرم یان ڕەق ببمەوە و تۆش رزگارت ببێت بەڵام لەم دواساتانەدا راستیەكانت بۆباس بكەم بهێڵە ئەوەی لەدڵمدایە بۆتی باس بكەم. باوكە ئەگەر بارێكی قورسم بەسەر شانتەوە و ناتوانی هەڵم بگریت دەڕۆم بەڵام بهێڵە پێتی بڵێم تاوان باری سەرەكی كێ یە.

بێ ئەوەی نرخ بۆ قسەكانم دابنێت وتی كاتم بەدەستەوە نی یە گوێ بگرم لەقسەی پڕوپوچ و بێمانای تۆ، بڕۆو لەبەرچاوم ونبە.

کاتێك باوکم دەیویست بڕواتە ژوورەوە هاوارم کرد باوکە بڕۆ لەپاڵ هاوسەرەکەتدا خۆش بەخت بیت کامەران بیت و تانە و تەشەریش لەکوڕی خۆت بدە، بچوکترین سۆز و بەزەیت بەکوڕی خۆتدا نەیەتەوە بەڵام ئەوڕاستیە بزانە سزای تاوانێکم دەدەیت هەرگیز نەمکردووە ئەویش لەوەڵامدا وتی: بێدەنگ بە و پاشان دەرگاکەی داخست و ڕۆیشت.

بەبەخت و برسی لەنێوان بەفرەکەدا دەلەرزیم و لەخۆوە کەوتمە بیرکردنەوە، رابردووم هێنایەوە بیری خۆم، رابردویەکی پڕ لەخۆشی و شادی. ئەوکاتەی تەمەنم (٧) ساڵان بوو شەوانە باوکم تا نیوەی شەو لەژورسەرمدا دادەنیشت و چیرۆکی بۆدەگێڕامەوە تا خەوم لێدەکەوت و لەگشت ئەو چیرۆك و داستانانەی بۆی دەگێڕامەوە زیاتر حەزم لەچیرۆکی پەری دەریا و شازادەی غەمگین بوو، لەشەوانی هاوینیشدا کەلەدەرەوە دەخەوتین داستانی ئەستێرەکان و کچی داستانی بۆدەگێڕامەوە و دەیووت: بیژەن کوڕەکەم هەموومناڵێك کەلەدایك دەبێت ئەستێرەیەکیش لەدایك بوونیدا دەردەکەوێت و کاتێکیش مرد ئەستێرەکەش دەکوژێتەوە و پاشان پاژان ئاماژەی کرد بە ئەستێرەیەك و وتی: ئەو ئەستێرەیەی لەگشتی ىگەشتر و جوانترە ئەستێرەی تۆیە، هەمووشەوێك بەرلەوەی چاوم بچێتە خەو چەندساتێك تەماشای ئەستێرەکەم دەکرد و باوکیشم دەیگوت هیوادارم ئەستێرەکەت هەرگیز خامۆش نەبێت.

شەوانە بەچاوی خەواڵووەوە تێر سەیری ئەستێرەکە و باوکمم دەکردوو گوێم بۆ چیرۆکەکەکانی شل کرد، ئەوساتانەش کەمنداڵتربووم

دەستی دەگرتم و دارەدارەی پێ دەکردم و فێری قسەکردنی دەکردم، یەکەمین وشەیش فێری بووم وشەی باوکە بوو.

کاتێک دەگریام فرمێسکەکانی دەسڕیم و هەم دایکیشم بوو هەم باوکیشم، بەڵام ئێستا دڵی سەرانسەر پڕبووە لە عەشقی ژنێک و بەتەواوی منی لەبیرچوەتەوە. لەگۆشەی شەقامەکەدا راوەستابووم، بیری رابردووم دەکردەوە لەناکاو وەک کەسێك لەخەو راچەڵەکێ خەبەرم بوەوە و پاشان سەیرێکی دەوروپشتم کرد هیچ کەسم بەدی نەدەکرد، تەنها چەند پاساریەك نەبێت لەسەر لق و پۆپی درەختەسنەوبەرەکان نیشتبونەوە، هەوا ساردو زوقماوی بوو لەخۆوە ملیی رێگام گرتەبەر لەکاتێکدا نەشوێنێکم هەبوو نەکەسیشم دەناسی.

کوچە و کۆڵان و شەقامی زۆرم بڕی هیچ کەس نەبوو یارمەتیم بدات و لێم بپرسێ. ئەودیوی شوشەی دوکانەکان پڕبوون لە شیرینی و خۆراکی جۆراوجۆر، جلوبەرگی گرانبەها و کۆشکی گەورەو رازاوەی زۆر لەدەوروپشتمدا بوون لەکاتێکدا بەبرسیەتی لەناو ئەوبەفرە سەختەدا سەرگەردان بووم.

پاش چەندسەعاتێك رێڕۆیشتن چومە دەرگای کەلاوەیەکی بچوك لەگۆشەیەکی شەقامەکەدا و بەنائومێدیەکەوە لەدەرگاکەم دا، دەرگاکە کرایەوە، راستەوخۆ چومە ژورەوە، پیرەژنێك و منداڵێکی چواردە ساڵانە لەگۆشەیەکی کەلاوەکەدا دانیشتبون، کەمێك نانیان دروست کردبوو سەرگەرمی نان خواردن بوون، دوکەڵێکی زۆر بەژورەکەدا بلاو بوبوەوە، چومە پێشەوە، پیرەژنەکە پرسی چیت دەوێت؟ وەلامم دایەوە شوێنم نیە لەبەر سەرما پەنام هێناوە بۆ ئێرە.

پیرەژنەکە هاتە پێشەوە و چەندساتێک سەیری ڕوخساری کردم پاشان وتی وەرە ژوورەوە با پێکەوە نان بخۆین، چوومە پێشەوە و لەتەنیشتیانەوە دانیشتم، لەسەر سفرەکەیان جگە لەدوو پارچە نان و کەمێک ماست هیچی تری بەسەرەوە نەبوو، یەک تیکە نان و کەمێک ماستیان پێدام.

پاش نان خواردنەکە، پیرەژنەکە ڕوخسارێکی جوان و بەسۆزی پێوەبوو، جێگەی لەپاڵ ئاگرەکەدا بۆداخستم و لێفەیەکی کۆنەی پێدام. لەلایەکی کەلاوەکەدا درەختێکی پرتەقاڵی لێبوو پرتەقاڵێکی بچوکیشی گرتبوو لەولاترەوە مێزێکی تەختەبوو هەندێک قاپ و تەوری بەسەرەوە بوو کاتی خەوتن پیرەژنەکە دەستی برد پرتەقاڵەکەی لەدرەختەکە کردەوە، بەئارامیەکەوە وتی: هەموو ساڵێک ئەم درەختە پرتەقاڵی زۆر دەگرێت بەڵام ئەمساڵ هەر ئەم دانەیەی گرتووە، پاشان دایبەدەستمەوە و وتی ئەم پرتەقاڵەش بۆتۆ کوڕی شیرینم، ئەبێت بمبەخشیت لەوە زیاتر لەتوانامدا نیە، وەڵامم دایەوە بەتەنهایی ئەم پرتەقاڵە ناخۆم، تۆ دابەشی بکە و کەمێکیش بدە بەمن، پرتەقاڵەکەی لەدەست گرتم و پاکی کرد و پاشان لەت لەتی کرد و کەمێکی دا بەکوڕەکەی و کەمێکی بۆ خۆی هەڵگرت و بەشە زۆرەکەشی دابەمن.

شەو لەپاڵ پیرەژن و کوڕەکەدا خەوتم، بەیانی ڕۆژ بویەوە پاش سوپاس گوزاریەکی زۆر خواحافیزیم کرد، ئەوکاتەی ویستم لەکەلاوەکە بچمە دەرەوە پیرەژنەکە هاتە پێشەوە و وتی: کوڕەگیان خۆتۆ ووتت شوێن وڕێم نیە کەواتە لەلامان بمێنەرەوە، کوڕەکەی من شاگردی میوە فرۆشێکە ئەگەر تۆش حەزبکەیت ئەتوانی لەگەڵی بڕۆیت و ببیتە شاگردی هەمان میوە فرۆش و شەوانە لەگەڵی بێیتەوە بۆماڵەوە.

پێشنیارەکەیم قبوڵ کرد، هەر ئەوڕۆژە لەگەڵ کوڕەکەی کەوتمە ڕێ، ئەویش وەک دایکی میهرەبان و دڵسۆزبوو، لەرێگەدا پرسیم ناوت چیە؟ وتی: ناوم (محمد)ە منیش وتم ناوم بێژەنە، کاتێک گەیشتینە ئەودوکانەی ئەو شاگردبوو لێی منی بردە لای خاوەن دوکانەکە و وتی مام عەباس تۆ داوای شاگردی تازەت دەکرد من بۆم پەیداکردویت، مام عەباسیش وردبویەوە لێم و سەیرێکی زۆری سەروپێی کردم و پاشان ڕوی کردە محمد و وتی ناتوانم ئەم کوڕە بکەمە شاگردی خۆم چونکە زۆرشپرز و چڵکنە. یەکسەر وتم:

مام عەباس (٩)ساڵم خوێندوە، لەوکاتەدا کەمێک بیری کردەوە و پاشان وتی باشە لەبەر ئەوەی خوێندەواریت هەیە بەکەڵکی ئێمە دێیت بەڵام بەمەرجێک سەرو قژت چاک بکەیت و خۆت رێک و پێک بکەیت تۆش رۆژی لە دوتمەن زیاترت پێ نادەم یەکسەر وتم باشە، هەمان رۆژ دەستم کرد بە کار، کارەکەی من پاک کردنەوەی دوکانەکە و فرۆشتن بو بە کڕیارەکان.

مام عەباس پیاوێکی زۆر بەهانە گیرو توڕە بوو، هەموو رۆژێک بەهانەی دەگرت و دەیگوت بۆچی میوەکان واڕیز دەکەن دەبوا پرتەقاڵەکان بەمشێوە ریز بکەن، رۆژ نەبوو بەهانە نەگرێت، هەموو رۆژێک لەگەڵ محمد دوکانەکەمان پاک دەکردەوە و سەرگەرمی رێک کردنی میوەکان دەبوین، گەرچی کارەکەمان قورس و گران نەبوو بەڵام توڕەیی و بەهانە گرتنەکەی مام عەباس ناڕەحەت و ماندوی دەکردین.

لەبەرامبەر دوکانەکەماندا کلیسایەکی گەورەی لێبوو تەنها رۆژانی یەکشەمە ئەوناوە قەرەباڵغ دەبوو، مام عەباسش رۆژانی یەکشەمە زەوق و شەوقی هەبوو لەبەر ئەوەی لەوڕۆژەدا فرۆشمان زۆر زۆر بوو،

بەسەربانی کلیساکەوە سەلیبێکی گەورە بەدی دەکراو لەدەرەوە ناوەوەی کلیساکە بەدی نەدەکرا بەڵام حەوشەی کلیساکە بەجوانی دیاربوو، محمد هەمیشە پێی دەوتم حەزدەکەم رۆژێك بچمە کلیساکەوە و تێر سەیری ناوەوە بکەم، محمد کوڕێکی زۆر میهرەبان و رەوشت بەرزبوو رۆژی سێ تمەن کرێی لێوەردەگرت تانیوەی شەو پێکەوە کارمان دەکرد هەمیشە مام عەباسیش دەیقیژاند بەسەرماندا و دەیگووت ناپارێزیم لەدەستان، شەوانە هەردوکمان پێنج تمەن کرێمان وەردەگرت و هەندێك کاتیش بەهانەی پێدەگرتین و خۆی تورە دەکرد و لەوپارە کەمەش برێکی لێدەبڕی، من و محمد گەر بمانویستایە بچوکترین قسە بکەین مام عەباس یەکسەر دەری دەکردین.

رۆژێکیان دەمەو نیوەڕۆ بوو پیرەپیاوێك ئارام هاتە دوکانەکە و راستەوخۆ بەرەو لای من هات و وتم کاکە چیت دەوێت؟ وتی شوتیەکی بچوکم دەوێت بایی دەریاڵ بێت (هەمیشە لەکۆتایی پایزدا ئەندازەیەك شوتی ئەنبار دەکرا) وەڵامم دایەوە ئاخر لەم وەرزەدا شوتی نیە بایی (١٠) بێت ریاڵ زۆرگرانە، کەمێك بیری لێکردەوە لەکاتێکدا زۆر پەرێشان دەکەوتە بەرچاو، وتی بڕۆ بەخاوەن دوکانەکە بڵێ بابێت بۆئێرە ناتوانم لەگەڵ تۆدا مامەڵە بکەم، منیش مام عەباسم بانگ کردوو ئەویش بەپەلە هاتە ژورەوە، پیرە پیاوەکە چوەپێشەوە و سڵاوی کرد و وتی مام عەباس ماوەیەکە منداڵەکەم نەخۆشە لەبەر ئەوەی پارەی دکتۆرم نەبوو کەمتەرخەمیم کردوو ئێستاش حاڵی زۆرخراپە و لەبەیانیەوە تائێستا دەگری و دەڵێت شوتیم دەوێت، ئێستاش تکات لێدەکەم شوتیەکی دەریاڵیم بدەرێ و پاشان دەستی بەرەو مام عەباس درێژ کردوو دە ریاڵەکەی دابەدەستیەوە، مام عەباسش وتی مامەگیان

لەم وەرزەدا شوتی دە ریالّی نیە و پاشان پارەکەی پێدایەوە، پیرە پیاوەکە لەکاتێکدا چاوەکانی پڕبوبون لەئاو وتی: دەی شوتیەکی بچوکم بدەنێ بەیانی پارەکەی دێنم بۆتان، مام عەباس دەستی بۆدیوارەکە درێژکردوو وتی بەدیوارەکەوە نوسراوە تکایە داوای قەرز مەکە، ناتوانم قەرز بەهیچ کەسێك بدەم ئەویش لەوەلامدا وتی: مام عەباس دراوسێی خۆتانم ئەو دەرگاشینە دەبینی! ئەوە دەرگای ماڵەکەمانە، مام عەباس بەتورەییەوە وتی: مامەگیان قەرز بەکەس نادەم، پیرە پیاوەکە خێرا پاڵتاوەکەی لەبەری داکەند و وتی: با پاڵتاوەکەم لێرەبێت لەبری پارەکەت تاپارەکەت بۆدێنم، مام عەباس ماوەیەك سەیری پاڵتۆکەی کردو زانی پاڵتۆکەی کۆنەیە و بەکەڵك نایەت خێرا دایەوە دەست پیرە پیاوەکە و وتی: ئەم شوتیانە نافرۆشین و برۆ لەدوکانێکی تر شوتی بکرە.

پیاوەکە بە روشکاوی و رووزەردی لەدوکانەکە چوە دەرەوە، پاش رۆیشتنی تۆفاتێك لەدڵم بەرپابوو بەزەیم دەهاتەوە بەرووخسارە زەرد و لاوازی و پشت چەماوەیی ئەو پیرە پیاوەدا، بیری دزینی شوتیەکی بچوك چوە سەرم و بیبەم بۆماڵەوە بۆی، لەکاتی نیوەڕۆدا بۆهەلێك دەگەڕام، دەمەو نیوەڕۆ عەباس ئاغا بۆنانخواردن رۆیشتەوە بۆماڵەوە و منیش شوتیەکی بچوکم هەڵگرت و بەبێ ئاگادارکردنەوەی محمد دورکەوتمەوە بەرەو ماڵی پیرە پیاوەکە، ماڵی پیرە پیاوەکە زۆر دوورنەبوو لێمانەوە خۆم گەیاندە ماڵەکە، دەرگاکە کراوەبوو، چومە ژورەوە لەحەوشەکەدا حەوزێکی زۆر بچوکی تێدابوو ماسی بچوکی سور تێیدا مەلەیان دەکرد، بەدیوارەکەشەوە چەندهێلانە کۆترێکی پێوەبوو، حەوشەکەیان زۆرگەورە نەبوو ژورێکی زۆر بچوکی تێدابوو

خێرا بەرەو ژورەکە رۆیشتم و دەرگاکەم کردەوە و چومە ژورەوە، ژورێکی تاریك و تەڕ و شێیاوی بوو، منداڵێکی بچوك بێدەنگ و ئارام بەسەر پەتویەکی کۆنەوەراکشابوو کومبارێکی کۆنەی لەژێردابوو، چاوە بیّ تینەکانی بڕیبوە سەقفی ژورەکە، پیرەژنێکی سەرسپی لەژور سەریەوە دانیشتبوو دەگریا، لەو ژورەدا تەنها چرایەك و چەند قاپ و دەوریەك بەدی دەکرا و جگە لەوانە هیچ شتێکی تری لیّ نەبوو، پیرەژنەکە کاتێك شوتیەکەی بینی بەدەستمەوە بەپەلە هەستایە سەرپیّ و شوتیەکەی لەدەستم گرت ئەوەندە خۆشحاڵ کەوتە بەرچاو وەکو بڵێی میوەی لەبەهەشتەوە بۆهاتبێت و وتی لەبەیانیەوە تائێستا کوڕەکەم داوای شوتیمان لێدەکات بیّ چارەکەی باوکی گشت شوێنێك گەڕا شوتیان پێنەدا لەبەر ئەوەی لەتمەنێك زیاتری پێنەبوو، خوا مام عەباس پایەدار بکات وابەهانامانەوە هات ئەزانم ئەم شوتیە مام عەباس ناردویەتی چون ئەزانم تۆ شاگردی ئەویت ماوەیەکە تۆ لەدوکانەکەی ئەودا ئەبینم.

پاشان شوتیەکەی بەچەقۆ لەت کردوو لەتێکی برد بۆ کوڕە نەخۆشەکەی، کاتێك گەیشتە ژور سەری و چەندجارێك بانگی لێکرد ئەسغەر هەستە شوتیم بۆهێناوی لەبەر ئەوەی وەڵامی نەدایەوە چەندساتێك سەیری رەنگە زەردهەڵگەڕاو و لەشە لاوازەکەی کرد، لەناکاو بەگریانەوە بەرەو دەرەوە رایکرد، چومە ژورسەری کوڕەکە چاوەکانی نابووبەیەکدا وەك ئەوە وابوو خەوی لێکەوتبێت بەڵام چ خەوێك ئەوخەوەی هەرگیز خەبەری نابێتەوە خێرا لەژورەکە هاتمە دەرەوە لەحەوشەکەدا ئەوپیرەژنە بێچارە بەدەنگی بەرزهاواری دەکرد، سەری دەکێشا بەدیوارەکەدا کاتێك ئەودیمەنەم بینی بڕیارم دا هەرچی

زوتره لەویٚ نەمێنم ژنە بێچارەکەش کاتێك بینی دەمەوێت لەماڵ بچمە دەروە بەدەنگێکی بەرز وتی بەمام عەباس بڵێ شوتیەکەی ناردبەڵام چ کات ناردی هیچ سودێکی نەبوو کوڕەکەم مرد، خێرا لەماڵ هاتمە دەرەوەو هاتمە سەرشەقامەکە، چەندهەنگاوێك دورکەوتمەوە لەناکاو تابلۆیەکی بچوك سەرنجی راکێشام، بەسەریەوە نوسرابوو پزیشکی تایبەت بۆ مندالان.

بەبینینی ئەوتابلۆیە ماوەیەك لەجێگای خۆم وشك بووم کوڕی ئەوماڵە لەبەر بێ دەرمانی مرد لەکاتێکدا دیوار بەدیواری ماڵەکەیان تابلۆی پزیشکی بوو بەڕاستی جیهانێکی سەیرە. بەناسۆر گەڕامەوە بۆ دوکان کاتێك محمد بەو روخسارە پەرێشانەوە بینیمی پرسی لەکوێ بویت ناچار بووم راستیەکەی بۆ باس بکەم ئەویش زۆر نیگەران بوو بەڵام شەو مام عەباس کاتێك ویستی کرێکەمان پێبدات سەرنجی دا یەکێك لە شوتیەکان نەماوە (٧) شوتی بوو ئێستا (٦) شوتی ماوە نە من قسەم کرد نە محمدیش. لەم کاتەدا مام عەباس بێئەوەی کرێکەمان بداتێ هەردوکمانی لەدوکانەکە کردە دەروە و وتی ئیتر پێویست ناکات لەبەیانیەوە بێن پێویستم بەشاگردی دز نی یە.

من و محمد بەدڵتەنگی و پەرێشانی گەڕاینەوە بۆماڵەوە و باس و خواستەکەم بۆ دایکی محمد گێڕایەوە، گەرچی زۆر ناڕەحەتیش بوو بەڵام هیچی نەوت.

لەبەر ئەوەی ئەوڕۆژە مام عەباس پارەی پێنەدابوین ناچار بووین هەرسێکمان بێ شێو سەربنێینەوە و بەیانی ڕۆژ بویەوە گشت شوێنێك گەڕاین کارمان دەست نەکەوت لەکۆتایدا ناچار بووم پاڵتاوەکەم بفرۆشم بە (٤) تمەن هەرچەند کۆنەش بوو، ئەو برە پارەیەش بۆماوەی

دووڕۆژ بـڕژێویمان پـێ هەڵـچەرخاند و ڕۆژی سـێیەم پارەمـان لێـبڕا و کەسیش کاری پێنەدەداین. لەو نێوەندەدا خۆمم بەتاوانباری سەرەکی دەزانی چونکە محمدو دایکی ژیانێکی ئارامیان هەبوو بەڵام بەهاتنی من ئەو ئارامییەیان لەکیس چوو.

ئەوان بەڕۆژی سێ تەمەن ژیانی خۆیانیان دەبردە سەر بەڵام بەدزینی ئەو شوتیە محمدم بەدەرکردن داو لەوپارە کەمەش بێبەشم کردن.

توانای ئەوەم نەبوو سەیری ناوچاوی محمد و دایکی بکەم گەرچی ئـەوان هیـچیان پـێ نـەدەوتم بـەڵام خـۆمم بەخەجاڵـەت بـار دەزانـی و دەمزانی هۆکاری سەرەکی سەرلێشێواویان من بووم لەڕاستیشدا هەرمن بووم. هەرچۆنێك بوو شـەو سـەرنج دەدەم محمد لـەتاو برسیەتی خـەوی لێنەدەکەوت.

کەوتمە بیری ڕێگا چارە، تەنها پەتویەکی کۆنەم بەدەستەوە مابوو بە (١٢) ریاڵ کڕیبووم لە دەستفرۆشێك بەڵام کاتێك ویستم بیفرۆشم بەدوو ریاڵیش نەیان دەکڕی.

بێئەوەی بە محمد و دایکی بڵێم بەمەبەستی دزی کردن لەکەلاوەکە چـوومە دەرەوە، شـەقام کـشومات گڵـۆپی عەمودەکـەی سەرسـەرم تانەندازەیەك دەوروپشتمی روناك کردبوەوە، بەئارامی دەستم کرد بە ڕۆیشتن، قاچەکانم لەگەڵم نـەدەهاتن وەك ئەوە وابوو بەمنـەوە نـەبێت و هەر لەخۆیانەوە بەرێدا دەڕۆن و دەستەکانیشم دەلـەرزین و وەك یەکێك پێم بڵێت بگەڕێوە بۆ کەلاوەکە، لەناخمدا دەنگێك پێی دەوتم بگەڕێوە نەمدەزانی ئەودەنگە لەکوێوە بوو رەنگە ویژدانم بوبێت.

لـەقوڵایی ناخمدا هێزێکـی بـەهێزتر لـەخۆم شـەڕی لەگـەڵ دەکـردم نەمزانی چی بکەم دەستەکانم فێری دزی نـەبون، ئـەم ڕەوشتە ناشیرینە

هێشتا لەمندا پەیدا نەبوبو، نەمدەتوانی بەڕێك و پێكی بڕیار بدەم ڕوخساری محمد و دایکی ئازاریان ئەدام کەوتبومە نێوان دوڕێگاوە یەکێکیان دەریای فەساد و خراپەکاری ئەوی تریان ڕەنج و خەفەت و ئازار.

لەم کاتەدا دەرگای ماڵەکان هەمووی داخراوبوون، کەس نەیدەزانی لەپشت دەرگاکانەوە چ رازێك هەیە، سەرەنجام ڕێگای یەکەمم هەڵبژارد ئەو ڕێگایەی دوچاری تەنگ و شەرمەزاری دەکردم.

دەرگای ماڵێکیان کراوەبوو چومە ژورەوە لەنێو تاریکی شەو و ترسی لەئەندازە بەدەر هەڵدەچۆقیم، بەهۆی تاریکیەوە هیچم بۆ دەستنیشان نەدەکرا تەنها لەدورەوە ژورێکی بچوك بەدی دەکرا و خۆم گەیاندە ئەوێ و لەگۆشەیەکدا خۆم شاردەوە، دەنگی ژنێکی گەنجم بەرگوێ کەوت دەیگوت علی دیسانەوە بەدەستی بەتاڵ گەڕایتەوە ئاخر بیرناکەیتەوە تۆ منداڵت هەیە، منداڵەکان هیچیان خەویان لێ نەدەکەوت بەزۆر خەواندنم، پەیمانم پێداون کە گەڕایتەوە شتیان بۆ دەهێنی و تۆش بەدەستی بەتاڵ گەڕایتەوە؟

پیاوەکە وەڵامی دایەوە و وتی: چیبکەم هەرشوێنێك دەگەڕام کار نەبوو و وەستاکەشم وتی کارت پێنادەم چونکە دوێنێ درەنگ هاتوی بۆسەر کار ئێستا دەبێت چی بکەم دزی بکەم ئەوکارەم پێ ناکرێت و تائێستا کاری لەوجۆرەشم نەکردووە و ناشی کەم، ژنەکەی لەوەڵامدا وتی منداڵەکان چی بکەن؟ ئاخر چی تاوانێکیان کردووە و ئەسغەر خەوی لێنەدەکەوت هەر دەگریاو دەیگوت دایکە برسیمە و منیش چیرۆکم بۆدەگێڕایەوە تاخەوی لێکەوت تۆ تەنها پێم بڵێ چی لەم منداڵانە بکەم.

پاشان تێگەیشتم بۆ شوێنێك هاتوم بۆ دزی خۆشیان نیازمەنی نانی ئێوارەن، ئاوڕی دەوروپشتی خۆمم دا لەخۆرئاواوە ماڵێکی زۆر رازاوە و جوان سەرنجمی راکێشا.

بێ ماتڵ بوون بەرەو روی کەوتمە رێ ئەودوخانوە زۆر لێکەوە نزیك بوون ئەوخانوەی کە هێشتا بەسەربانەکەیەوە م، لەگەڵ ئەو خانوە رازاوەیە پێکەوە لکابوون. بازێکم داو خۆم فرێدایە خوارەوە لەتەنیش دیوارەکەوە درەختێکی سنەوبەری بەرزی تێدابوو، پاشان بەهەڵمەتێکی تایبەتی کە تائەوساتە بەخۆمەوەی نەمدیبوو بەدرەختەکەدا هاتمە خوارەوە.

بۆنی خواردن گێژی کردبووم لەرێگایەکی باریك کە هەردوولای بەدرەختەوە گیرابوو بەرەو خانوەکە کەوتمە رێ و سەرنجمدا کەس لەڕێڕەوەکەدا نەبوو بەبێ پەروا بەڕاڕەوەکەدا رۆیشتم، لەناکاو گوێم لەدەنگی پێکەنینێك بوو ناچاری کردم وەکو بزمار لەجێگەی خۆمدا بچەقم.

چەندساتێك لەجێگەی خۆم راوەستام، دڵم تەپەتەپی دەکرد، لەترساندا دەلەرزیم، پاشان دوبارە کەوتمەوە ڕێ. چەند هەنگاوێك چێشتخانەکەی لێمەوە دوربوو، چومە چێشتخانەکەوە چەندین قابلەمەی گەورە و بچوك لەسەر تەباخەکەدا بو بەئارامی سەری قابلەمەیەکیانم لابرد و پلاوێکی زۆری تێدابوو.

بەپەلە سەتڵێکم هەڵگرت و هەموو پلاوەکەم تێکرد و پاشان سەری قابلەمەیەکی تریانم هەڵدایەوە پڕبو لەشلە، بەپەلە هەموو شلەکەم کرد بەسەر پلاوەکەدا، پاشان بەپەلە خۆم گەیاندەوە حەوشەکە و بەلام نەمدەزانی دەرگای حەوشەکە لەکوێدابوو، ماوەیەك درێژەی کێشا تا

دەرگـای حەوشـەکەم دۆزیـەوە، ئەوسـاتەی دەمویـست بـچمە دەرەوە دەنگێکم بەرگوێ کەوت هاواری دەکرد دزە دزە بەڵام تازە درەنگ بوو من چومە دەرەوە و راستەوخۆ گەڕامەوە بۆ کەلاوەکە، محمد و دایکی لەکەلاوە ساردەکە خەویان لێکەوتبوو خێرا خەبەرم کردنەوە کاتێك محمد چاوی بە پڵاوە پڕلە شلەکە کەوت هەروەکو شێت بەپەلە لەسەر جێگاکەی هەستایە سەرپێ.

دایکی محمد بەپێکەنینەوە وتی:

بێژەن ئەمانەت لەکوێ بوو؟

وتم پێشتر لەماڵێکدا نۆکەر بووم چومەوە بۆماڵی ئاغاکەم ئەمشەو ئەوان قوربانیان کردبوو وە ئەم سەتڵە پڵاوەیان دابەمن و وتی:

هەندێکی بۆخۆت و هەندێکیشی بدە بەودراوسێیانەی دەست کورت و هەژارن.

دایکی محمدیش هەندێکی هەڵگرت و ئەویتریشی دابەدەستمەوە و بردم بۆ ئەوماڵەی سەرەتا ویستم دزی لێبکەم.

کاتێك گەیشتمە ئەوێ هێشتا دەرگای حەوشەکەیان کراوەبوو چومە ژورەوە و چەند تەقەیەکم دا لەدەرگای ژورەکەیان، پیاوێکی باڵا بەرز دەرگای کردەوە. نیو سەتڵە پڵاو و شلەکەم دابەدەستیەوە نیوخولەکێك بەسەرسامیەوە سەیری کردم، بەپەلە وتم ئێمە دراوسێی خۆتانین ماڵەکەمان لەم نزیکانەدایە ئەمشەو خێرمان کردووە وامنیش بۆم هێناون. بەخۆشحاڵیەکەوە سەتڵەکەی دابەدەست ژنەکەیەوە و وتی:

دەتناسم شاگردی مام عەباسیت زۆرجار لەوێ بینیومیت، وەڵامم دایەوە : بەڵێ وایە من شاگردی ئەوم، بەپەلە خواحافیزیم کرد و گەڕامەوە بۆ کەلاوەکە.

محمد و دایکی هەرچەند برسیان بوو بەلام دەستیان بۆنان نەبردبوو چاوەڕوانی منیان کردبوو، پاش نانخواردن چوین بخەوین.

بەیانی ڕۆژ بویەوە لای ئێوارەوە دایکی محمحد کاتێك بۆ ئاومێنان چوبوە دەرەوە لەگەڕانەوەیدا وتی: بیژەن بەڕاستی پێم بڵێ دوێنەشەو ئەوخواردنەت لەکوێ بوو؟ وەلامم دایەوە:

راستیەکەت پێدەڵێم بەومەرجەی سەرزەنشتم نەکەیت، ئەو خواردنەم دزی بوو.

بەناڕەحەتیەکەوە وتی:

بیژەن ئەوەی چوو چوو، بەلام لەئێستە بەولاوە ئەوجۆرە کارانە مەکە و خاوەنی ئەو ماڵەش بەدوای تۆدا دەگەڕێن پێویستە ئاگات لەخۆت بێت چونکە تائەندازەیەك دەتناسێ.

پاش قسەکانی دایکی محمد بڕیارمدا لەوشارە رابکەم، بەیانی تەنها داراییەکەم پەتویەکی شڕەبوو هەڵمگرت و کەوتمە رێ.

دایکی محمد پرسی:

بیژەن بۆکوێ دەڕۆیت؟

بەئارامیەکەوە وەلامم دایەوە:

دەڕۆم بەدوای کاردا لەوانەیە پارەم دەست بکەوێت. لەوەلامدا وتی:

بڕۆ بەلام زوو بگەڕێیتەوە من زۆر بێتاقەتت دەبم لەوانەیە دوچاری شتێك ببیت.

بەپەلە وەلامم دایەوە:

زۆر زوو دەگەڕێمەوە، کاتێك لەماڵ ویستم بڕۆم دەر دڵ پڕلە پەژارەبووم حەزم دەکرد بڕۆمە پێش و دەستی دایکی محمد ماچ بکەم لەبەر ئەوەی لەشەوێکی سارد دا پەنای دام و لەمەترسی رزگاری کردم.

بەڵام من لەبەرامبەر ئەو هەمووچاکانەدا بوومە هۆکاری بەتبەختیان نەمدەزانی چی بکەم.

حەزم دەکرد سوپاسی دایکی محمد بکەم. بەڵام بەداخەوە نەمدەتوانی راستیەکەی پێبڵێم چون نەیدەهێشت بڕۆم، منیش هەرساتێك بوایە دەستگیر دەکرام.

بەهەرزەحمەتێك بوو کەلاوەکەم بەجێهێشت.

وەرزی بەهار نزیك بووەوە بەپەلە ئەوناوەم بەجێهێشت، هەر ئەندازەیەك لەوشارە دورتر بکەوتمایەوە ئارامی زیاتر لەناخمدا دروست دەبوو گەرچی برسیەتی تەواو هەراسانی کردبووم بەڵام هیچ چارەیەکی ترم نەبوو.

نزیکەی دەمەو ئێوارە گەیشتمە سەر تەپۆڵکەیەکی سەوز باڵندە رەنگاو رەنگەکان پۆل پۆل لەبۆشایی ئاسماندا هەڵدەفڕین. خۆر بەهەموو قەبارەکەیەوە لەئاسۆی کێوە سەرکەشەکان خۆی دەشاردەوە، ئاسمان وەك دەریایەکی ئارام وبێشەپۆل دەهاتە پێش چاو، درەختی چڕو پڕ دەکەوتنە بەرچاو کەبەلقەکانیانەوە چرۆ و گوڵی رەنگاو رەنگیان پێوە بوو، بایەکی هێواش بەنێوانیاندا تێدەپەڕی، جۆگەلەی باریك و درێژ بەنێوان درەختەکاندا تێدەپەڕی. ئاوی جۆگەکان ئەوەندە رون بوون بەئاسانی بەردو زیخی ناویان دەبینرا.

من لەنێوان ئەو سروشتە جوانەدا برسی و بێ ئامانج دەڕۆیشتم، پاش ماوەیەکی کەم خۆر بەتواوی ئاوابوو مانگیش بەنێو چاوانی ئاسمانەوە خۆی دەرخست وەکو کەشتیەکی سەرگەردان خۆی بۆناوەڕاستی ئاسمان دەکێشا.

هەموو شتێك كش و مات بوو تەنها دەنگی چۆڕە چۆڕی ئاوەكان دەهات، مانگ لەنێوان لق و پۆپی درەختەكان دەردەكەوت، ئاسمان پاك وبێگەرد بوو ، بایەكی هێواش و نەرمی دەهات و لق و پۆپی درەختەكانی بەئارامی رادەوەشاند، لەوشوێنەدا نە مرۆڤ بەدی دەكرا و نە ئاژەڵ، تەنها جارجارە دەنگی باڵی باڵندەكان و دەنگی كونەبەبوو بەرگوێ دەكەوت.

شەوم بەبرسیەتی لەنێوان ئەو سەوزەلانیەدا رۆژ كردەوە، تەنها پەتویەكی كۆنەم پێبوو تا ئەندازەیەك لەسەرما دەیپاراستم، تابەرەبەیان مانگ لەئاسمانی ساف و بێگەرد دا دەدرەوشایەوە، هەموو شوێنێكی روناك كردبوەوە.

رۆژی دوایی زۆر زوو لەخەوهەستام، هێشتا خۆر لەكێوە سەركەشەكانەوە هەڵنەهاتبوو، هەوا نەڕوناك بوو نە تاریك، شەونمیش وەكو ئەڵماس بەسەر گوڵەكانەوە دەدرەوشانەوە، شەماڵی كازیوەش شەونمەكانی بەسەر گوڵەكانەوە دەكردەوە.

هەموو شوێنێك گوڵ و گوڵزار بوو ، لەهەوای پاك و بێگەردی ئاسماندا و لەسەر درەختەكانەوە باڵندە دەنگ خۆشەكان بەرچاو دەكەوتن، پەپولە بچكۆلەكان بەباڵە جوانەكانیانەوە بەسەر سەوزی و گوڵەكانەوە دەبینران. لەقەراخ جۆگەكاندا وەنەوشە چەپك چەپك روابوون، هەركات چرۆیەك یان گوڵێك بەهۆی باكەوە بوەریایە دەكەوتە ناو ئاوی جۆگەكان، هەندێجار گوڵی سپی و پەمەی لەسەر ئاوەكە دەبینراو لەگەڵ خۆی دەیبردن، لەوساتانەدا مرۆڤ دەكەوتەوە بیری زەمانە چون زەمانە هەروەك ئاوەكە دەماندا بەیەكدا و لەگەڵ خۆی

دەمان بات، لەبەر ئەوەی هیچ جۆگەلە و روبارێك بەرەو سەرچاوەکەی ناگەڕێتەوە زەمانەش بەرەو دواوە ناگەڕێتەوە.

پاش ماوەیەك هەتاو لەپشت کێوە بەرز و بەفرینەکانەوە سەری هێنایە دەرەوە و ئەو سەوزی و گوڵانەی تائەوساتەی لەژێر ئاسمانی تاریکە شەودا خەویان لێکەوت بوو، بەتیشکی هەتاوەکە لەخەو راچەڵەکین و دەستیان بەخەندە کردەوە.

لەبرساندا سەرم گێژی دەخوارد، لەپەل و پۆ کەوتبوم نەمدەتوانی بڕۆم بەڕێگەدا ئەو هەموو دیمەنە جوانانە بەلامەوە بێ بایەخ و ناشیرین بوون، تەنانەت پێکدادانی لق و پۆپەکان نارەحەتیان دەکردم، حەزم دەکرد هیچ شتێکم لەدەور و پشت نەبێت، سەیری هەرلایەکم دەکرد جگە لەگوڵو رێحانە هیچی تر بەدی نەدەکرا.

بەو برسیەتیەوە چۆن دەمتوانی هەست بەجوانیەکانی سروشت بکەم، حەزم دەکرد هیچ لەڕێگەکەم نەبێت، هێزو توانام لێ بڕابوو، هەتا دەمەو نیوەڕۆ بەوحاڵەوە بەڕێگاوە بەردەوام بووم ئەو چەند سەعاتە بەلامەوە سەدەیەك بوو. هەتاو ئەستون بوو لەسەر سەرم.

دەنگی شمشاڵی شوانێکم لەدورەوە گوێ لێ بوو ئەوەندە خۆش لێی دەدا دەچوە دڵی مرۆڤەوە و خەم و پەژارەی لەدڵی دەردەکرد، بەرەو روی شوانەکە کەوتمە رێ، پۆلێ بەرخی سپی بەهێواشی بەلابەلای تەپۆڵکەدا دەلەوەڕان و دەنگی زەنگی گەردنیان لەدورەوە دەبیسترا، خۆم گەیاندە شوانەکە.

گەنجێکی بیست ساڵانەبوو لەسەر تەختەبەردێك دانیشتبوو پشتی نابرو بەدرەختێکەوە، شمشاڵێکی درێژی بەدەستەوە بوو بەئارامی شمشاڵی لێدەدا، کاتێك منی بەو روخسارە شپرزیەوە بینی بەردو روم

هات، وتی لەکوێوە دێیت لەخەڵکی ئەم دێیە ناچیت، وەڵامم دایەوە لەشاری ئەم دێیەوە هاتوم دیسانەوە وتی: مەگەر لێرەدا خزمت نیە؟ وەڵامم دایەوە نەخێر رێبوارم، پاشان وتی: ئێستا ئەتەوێت بۆکوێ بڕۆیت؟ لەبەر ئەوەی زۆرم برسی بوو وتم برسیمە هێزم نیە بڕۆم بەڕێگەدا، هەر کە ئەمەی بیست هاتە پێشەوە و دەستی گرتم و وتی وەرە ئەم نیوەڕۆیە بڕۆینەوە ماڵی ئێمە، بەبێ ماتڵ بوون کەوتمە دوای و هەردوکمان بەپەلە لەگردۆڵەکە هاتینە خوارەوە، لەگەڵ خۆی بردمی بۆلای چەند پیاوێك کەلەدەوری درەختێك کۆبوبونەوە، بەدەنگێکی بەرز وتی میوانم بۆ هێناون. پیاوێکی باڵابەرز کەسەرگەرمی قسەکردن بوو وتی: کارێکی زۆر باشت کردو پاشان شوانەکە زەردەخەنەیەکی کردو وتی: ئەوپیاوە باوکمە، منیش یەکسەر کەوتمەوە بیری باوکم، ئەو ئێستا لەباخەڵی ژنەکەیدایە و هەرگیز منی بیرناکەوێتەوە، رەنگە واش بزانێ هەرئەو شەوە لەناو بەفرەکەدا رەق بویمەوە و رزگاری بوبێت لەدەستم.

باوکی شوانەکە بەرەو روم هات و وتی ناوت چیە؟ لەوەڵامدا وتم بێژەن، دەست بەجێ وتی بێژەن دەتەوێت بزانی بۆنیوەڕۆ چیمان هەیە؟ ئەمڕۆ مەڕێکمان سەربڕیوە و پاکمان کردووە و لەبەردەم ئەو ئاگرەدایە کەدەورمان داوە، پاشان روی کردە کوڕەکەی و وتی: پیاڵەیەك چای بۆتێبکە، شوانەکەش بەبێ ماتڵ بوون چایەکی بۆتێرکردم و خواردمەوە، تا ئەندازەیەك وزەم تێهاتەوە لەوکاتەدا یەکێك لەپیاوەکان وتی کوڕەکە مەگەر تۆ لەم دێیەدا خزمت نیە؟ وەڵامم دایەوە: نەخێر من هیچ کەسم نیە ئەمڕۆ بەڕێکەوت رێك کەوتوەتە ئێرە بڕیارم داوە لەم شارە دوربکەومەوە چون باوکم دەری کردووم.

لەوکاتـــەدا شـــوانەکە روی تێکـــرد و وتـــی بۆچـــی باوکـــت دەری کردوویت؟ وەڵامم دایەوە لەبەر ئەوەی خۆشی نەدەویستم و بڕیاری دا لەماڵەکـــەی دەرم بکـــات، ئـــەو لەوەڵامـــدا تـــەنها ســـەرێکی راوەشـــاند تێنەگەیشتم لەمەبەستەکەیبۆچی سەری راوەشاند.

پاش ماوەیـەك کـەباب ئامـادە بـوو شـوانەکە لەگـەڵ بـاوکی گۆشتی بـرژاو و پارچـەیەك نانیـان لەبـەردەمم دانـا، ئەوەنـدە برسـیم بـوو چاوەڕوانی خـوڵکی ئـەوانم نـەکرد، دەسـتم کـرد بـەخواردن پـاش نـانخواردن پـەرداخێك شـیریان دامـیٚ و بەتـەواوی تێـر بـووم و گیـانم هاتەوەبەبـــەردا، پاشـــان دەســـت و دەموچـــاوم شـــۆرد لـــەئاوی ئەوجۆگەلەیـــەی بەتەنیـــشتماندا تێدەپـــەڕی. وێنـــەی لـــق و پـــۆپی درەختـەکان لەئاوەکـەدا دەردەکـەوت وەکـو ئـەوە وابـوو لـەناو ئاوەکـەدا درەخت و گوڵ روابێت.

کاتێك ویستم بکەومە رێ، پەتوەکەی دەستم کە هەموو سەروەتی من بوو بەخشیم بەشوانەکە لەم کاتەدا باوکی شوانەکە هاتە پێشەوە و وتی بێژەن تۆ ئەم پەتوە ئەدەیت بەکوڕەکەی من ئەی لەم سەرما سەختەدا چی دەکەیت؟

پاشان پەتوەکەی لەدەست کوڕەکەی سەندەوە و دایەوە بەدەستمەوە و وتـــی پەتوەکـــە بۆخـــۆت، و هەنـــدێ کـــەبابی پێـــچا لەنانێکـــەوە و دایبەدەستمەوە و وتـی ئەمـە بۆ توێشوی رێگـات ، پاش خواحافیزی لێیان رۆیشتم.

ئێـــستا بەباشـــی جوانیـــەکانی سروشـــتم دەبینـــی بـــۆنی گـــوڵ و خونچەکان گێژیان کردبووم.

جادەی پێچاو پێی زۆرم بڕی پاش چەند سەعاتێك ڕێگا ڕۆیشتن گەیشتم بەدەریاچەیەکی بچوك، کەشتی لەقەراغ دەریاچەکە لەنگەریان گرت بوو، کەمێك سەیری دەورو پشتم کرد زۆر قەرەباڵغ نەبوو بەزەحمەتێکی زۆر سواری کەشتیەك بووم، وادەردەکەوت کەشتیەکە کەشتی بار هەڵگربوو، خۆمم لەپشت سندوقێکەوە شاردەوە.

زۆری پێ نەچوو کەشتیەکە کەوتە ئیش، بەڵام لەپشتی سندوقەوە نەمدەتوانی سەیری هیچ شوێنێك بکەم. ڕۆژی یەکەم بەوشێوەیە لەناو ئەو سنوقەدابووم و ئەو بڕە نانەو کەبابەی کە پێیان دابووم فریام کەوت. ڕۆژی دووەم لەناکاو پیاوێك بەرەو سندوقەکە هات و دڵم کەوتە تەپەتەپ ، هەناسەم سوار بوو لەخۆمەوە دەلەرزیم، کاتێکمزانی لەپشتەوە دەستێك بەرزی کردمەوە، بەپەلە ئاوڕم دایەوە، پیاوێکی باڵا کورتم بینی یەخەی کراسەکەمی گرت و بەتوڕەییەکەوە وتی:

هەتیو لێرەدا چی دەکەیت بۆچی بەبێ مۆڵەت هاتویتەتە ناو ئەم کەشتیەوە؟ وەڵامم بۆ نەدەدرایەوە نەمدەتوانی هیچ بڵێم، دوبارە پرسی لێرەدا چی دەکەیت وەڵامم بدەرەوە، دیسانەوە بێدەنگ بووم، کارکەرانی ناوکەشتیەکەی بانگ کرد و وتی ئەم هەتیوە لەشوێنێکدا زیندان بکەن تادەگەینە جێ و تەسلیمی دەستی پۆلیسی دەکەین لەبەر ئەوەی بەمەبەستی دزی هاتوەتە ناو کەشتیەکەوە منیش یەکسەر لەجێگەی خۆمدا ووشك بووم.

لەم کاتەدا دووکەس لەکارکەرەکانی کەشتیەکە بەرەو ڕووم هاتن، منیش یەکسەر خۆمم هەڵدایە ناو دەریاکەوە چەندینجار ژێر ناو دەکەوتم و دەهاتمەوە سەرەوە گەرچی تائەندازەیەك مەلەم دەزانی بەڵام

مەلـەوانی تـەواو نـەبووم بتـوانم لەودەریاچـە رزگـارم ببێـت، سـەیری هەرلایەکم دەکرد هەر ئاو بوو. خۆم خستبوە ناو دەریا لوشی مەرگەوە.

لەوساتانەدا وام دەزانی هەرگیز رزگارم نابێت بەڵام دیسانەوە لەگەڵ مەرگدا بەشـەڕ هـاتم و دەمویـست بـژیم و زینـدوو ببمـەوە چـون حـەزم لەژیان بوو، بەڵام مەرگ بەهەموو توانایەوە شەڕی دەکرد لەگەڵم.

هـەر لەوکاتـەدا یـەکێك لـە سەرنشینەکانی نـاو کەشتیەکە چـوپێکی هەڵدایە ناو دەریاچەکەوە، گوێم لێبوو خاوەنی کەشتیەکە بەتوڕەییـەوە وتـی بۆچـی ئەوچوپەتان بـۆ فڕێـدا؟ پێویـستە نـوقم ببێـت و بخنکێـت، پاشان کەشتیەکە بەپەلە ڕۆیشت و دورکەوتەوە.

هەموو هێزێکی خۆمم خستە گـەڕ بۆئەوەی لەچوپەکە نزیك ببمـەوە بەڵام کاتێك لێی نزیك دەبوومەوە شەپۆلی دەریاکە و ڕەشەبا چوپەکەی لێ دوردەخستمەوە، بەڵام بەهەرحاڵێك بوو چوپەکەم گرتەوە و لـە مردن ڕزگارم بـوو. ڕق و کینـی دەریاچـەکە سـات لـەدوای سـات زیـادی دەکـرد شـەپۆلەکانی خـۆم و چـوپەکەی بـەرز دەکـردەوە، سـەیری هەرلایـەکم دەکـرد هـەر ئـاو بـوو تەنانـەت ئاسمـانیش بەلامـەوە ئـاو بـوو، ئـاوی دەریاچـەکە لەهەرچـوارلاوە ژیـانمی گـەمارۆ دابـوو بەرزی دەکردمـەوە و ساتێك لەژێر ئاوەکەدا خـۆمم دەبینیـەوە، تەنگـە نەفـەس بووبـوم توانـای خـۆڕاگیرم نـەبوو، زۆر بـە ناڕەحـەتی و زەحمەتـەوە بـەهۆی چـوپەکەوە خۆمم دەخستەوە سەر ئاوەکە لەناکاو شەپۆلێکی گەورە بەرەو ڕوم هـات تاوێـك بەسـەر شـەپۆلەکەوە بـووم و تاوێـك دەکەوتمـە ژێـر شـەپۆلەکەوە بایـەکی تونـدی دەهـات لەگـەڵ شـەپۆلەکە دەیـان ویـست چـوپەکەم لـێ بسەنن بەڵام من هەر بەردەوام بووم لەخۆڕاگری.

لەدڵی خۆمدا دەموت ئایا لەم گێژاوە ترسناکە رزگارم دەبێت چون ئەم دەریاچە بچوکترین بەزەیی بەمندا نایەتەوە، وەك پەڕێك وابووم بەسەر دەریاچەکەوە بۆهەموولایەکی دەبردم، هەندێك جار لەترساندا هاوارم دەکرد بەڵام دەنگی شەپۆلەکان ئەوەندە گەورەبوون دەنگی هاوارەکانمی دەشاردەوە و کپی دەکردن.

لەڕاستیدا گەر ئەم دیمەنە ترسناکە هەرکەس بەخەویش بیبینایە دڵی لەلێدان دەکەوت، بەڵام من دوچاری ئەو چەرمە سەریە بووم نازانم بەچ شێوازێك ئەو دیمەنە ترسناکە بخەمە سەر کاغەز بۆتان.

لەکۆتایدا هێدی هێدی شەپۆلەکان ئارام بوونەوە، ئەو شەپۆلانەی دەیان ویست نوقمم بکەن و هەڵم لوشن. ئاسمانی ساماڵ و بایەکی هێواش بەرەو پێشەوە لێیان دەخوڕیم هەرکات سەیری دەوروپشتم دەکرد وامدەزانی ئاسمان و دەریاچەکە پێکەوە لکاون هەتا و بەرویەکی خەماویەوە لەدەریاچەکە ئاوادەبوو تیشکە زەردەکەی هێشتا روناك بوو، ئەمجارەیان ئەودەریاچە شینەی خەریك بوو تێیدا نوقم ببم رەنگەکەی گۆڕا بۆ رەنگێکی زەرد، ئاسمان و دەریاچەکە رەنگیان زەرد هەڵگەڕابوو وەك بڵێی هەتاویش دوچاری چارەنوسەکەی من هاتبێت لەبەر ئەوەی ئارام ئارام بەقولایی دەریاچەکە رۆدەچوو، کاتێك هەتاو بەتەواوی لەبەرچاوم وون بوو لەپڕ پەردەیەکی رەشی تاریك هەموو شوێنی داپۆشی، گشت لایەك تاریك بوو.

تاریکی شەو ئەشکەنجەی دەدام، شەوی درێژی تاریکیش کۆتایی هات دیسانەوە هەتاو بەئاسمانەوە دەرکەوت و وەکو خۆر پەرستان بەسەر چوپەکەوە کرنوشم بۆ برد، وتم لەڕاستیدا تۆ شایەنی ئەوەیت

خۆر پەرستان بتپەرستن ئەمڕۆ لەسەردەمی پێشکەوتندا وا کڕنوشت بۆدەبەم.

هەتاو سروشتێکی تازەی لەناخمدا چەقاند، لەخۆمەوە هاوارم کرد خوایا فریام بکەوە و لەم گێژاوە رزگارم بکە گەرچی بەندێکی بێدەسەلاتی تۆم بەڵام حەزدەکەم ئەم ئارەزوەم بێنیتە دی و لەم دەریاچە رزگارم بکەیت، تەنها تۆ لەم دونیایە پەناهگای منی جگە لەتۆ هیچ کەسی تر شك نابەم.

گەرچی بەرەو پێشتر دەڕۆیشتم برسیەتی و ماندویەتی ئازاریان ئەدام، هەرچۆنێك بوو تا دەمەو نیوەوڕۆ بەپەلە بەرەو پێش دەڕۆیشتم پاشان لەدورەوە تارماییەکم بینی لەجولەدا بوو هەستم کرد نزیك بومەتەوە لەلێواری دەریاچەکە، ئەو تارماییە رەشانەش باڵندەی دەریاچەیی بوون لەنزیك لێوارەکاندا بەئاسمانەوە بوون لەپڕ شادی و چەخماخەی شادی کەوتەوە چاوە سیس هەڵگەڕاوەکانم.

ئەی ژیان تۆ چەند ئازیزیت هەرچەندە لەم دنیایە هیچ شتێکم نیە پشتی پێ ببەستم واتە هیچ شتێك و شوێنێك لەم دونیایە نیە کەبەناوی منەوە بێت گەرچی ئەگەر بڕیار بدرایە هەرکەس لەسەر شتی خۆی رابوەستێت و بژی من بەقەدەر جێ پێیەکم لەم دونیایە نیە لەسەری رابوەستم و بژیم. کەواتە ژیانی پڕ چەرمەسەری و ئازار و ئەشکەنجە بۆ پارویەك نان خستمیە ناو گێژاوی مەرگەوە بەڵام دیسانەوە ژیانی ئازیز کە لەڕاستیدا هیچ شتێك نیە لەژیان ئازیزتر بێت گەیاندمیەوە لێواری دەرباز بوون.

پاش رەنج و ئازارێکی زۆر گەیشتمەوە قەراخ دەریاچەکە من سەرکەوتم چ سەرکەوتنێك ئومێدم بەهیچ شتێك نیە بەڵام هەر

بەسەرکەوتنی دەزانم چونکە گیانی نازیزمی لەوگێژاوە ترسناکە رزگار کرد. گەیشتمە وشکانی، بابزانین چی روودودات، نازانم بەسکی برسی و گیانێکی شەکەتەوە بەرەو لایەك کەوتمە رێ و چوپەکەم هەلگرت بۆئەوەی بیفرۆشم و بیدەم بەنانێك تالەبرسیەتی رزگارم ببێت، چوپەکەم فرۆشت بە پێنج تمەن ئەو برە پارەیەش توانی بۆماوەی سێ رۆژ لەبرسیەتی رزگارم بکات رۆژی چوارەم بەدەستی بەتاڵ لەقەراخی دەریاچەکە دانیشتم و سەیری دەوروپشتم دەکرد و هەندێك بێ خەبەر لە بەتبەختی لەقەراغ دەریاکەدا مەلەیان دەکرد هاواری شادیەکانیان لەگشت لایەکەوە بەرگوێ دەکەوت، ژنان بەو جەستە جوانانەیانەوە کە تەنها بەشێکی لەشیان داپۆشرابوو بەئارامی لەملا بۆ ئەولا مەلەیان دەکرد، بەسەر لمی قەراغ دەریاچەکەوە ژن و پیاوێکی زۆر راکشابوون لەدەورو پشتی ئەوانیشدا منداڵان سەرگەرمی یاری کردن بوون.

لەتەنیشتمەوە ژن و پیاوێکی گەنج دانیشتبوون و بەباشی گوێم لەقسەکانیانەوە بوو ژنەکە دەیگوت ئەبێت ئۆتۆمبیلێکم بۆ بکڕیت لەم شارەداهاوتای نەبێت پیاوەکەش لەوەڵامدا دەیگوت: ئێمە لەپێش هەمووشتێکەوە پێویستمان بە ڤیلایەك هەیە بهێڵە باڤیلاکە بکڕم پاشان ئۆتۆمبیلێکی زۆرجوانت بۆدەکڕم.

لەنێوان ئەو هەموو خەڵکەدا کچێکی جوان زیاتر سەرنجی راکێشام قژێکی ئاڵۆزکا و چاوێکی گەورەی پێوە بوو گۆزەیەکی بەدەستەوە بوو بەرەولای من دەهات، چاوەکانی گەورە وەك ئاوی دەریاکە شین بوو زۆر لەڕادە بەدەر جوان بوو. بەبینینی دڵم کەوتە تەپەتەپ و رەنگم پەڕی دیسانەوە سەیرێکی روخساریم کرد زۆر نزیك بویەوە لێم،

ئـەمجارەیان چـاوە شـینەکانی سـیس و رەنگـە جوانەکـەی زەرد هەڵگەڕابوو هەر بەرەو پێشەوە دەهات ئەویش سەیری دەکردم سەیرێك کەسەرتاپای لەرزاندم گشت گیانمی هێنایە لەرزە لەخۆیەوە نیگای منی بەلای خۆیدا رادەکێشا.

لەبـەردەم منـدا منداڵـەکان بـەلم چـاڵ و خـانوی بچوکی منداڵانـەیان دروسـت کردبـوو. ئەوسـاتەی هاتـە بـەردەمم قاچـی کەوتـە نـاو چـاڵی منداڵەکانـــەوە کـــەوت بەزەویـــدا. منـــیش چـــاوەڕوانی دیمـــەنێکی بەوشێوەیەبووم بـەرەو رووی رۆیشتم گۆزەکـەی کەوتبوە سـەر لمەکـە و ئاوەکەی نـاوی بەهێواشـی ئـەڕژا بەسـەر لمەکـەدا. لەوکاتـەدا سـەیرێکی کردم و نیگاکەی وەکو ئاسمانی بێهەور و دەریایەکی بێ شەپۆل کەوتە بەرچـاوم، زۆر لێـی نزیـك بومـەوە لەنزیکیـەوە راوەسـتام و سـەیری روخسارە ئاسمانیەکەیم دەکرد.

دەستی بەرەو گۆزەکە درێژ کرد. بەپەلە وتم:

ئامـادەم گۆزەکـەت بۆهـەڵبگرم تاماڵـەوە، چەندسـاتێك بێـدەنگ بـوو هەستم کرد حەزناکات گۆزەکەی بۆهەڵبگرم بـەڵام پـاش چـەند خولـەکێك بـەئارامی وەڵامـی دایـەوە باشـە ئەگـەر زەحمـەت نـەبێت بەلاتـەوە هـەڵی بگرە بۆم.

پاشان هەردوکمان کەوتینەڕێ و لێم پرسـی: نـاوت چـی یە؟ وەڵامـی دامەوە ناوم نێرگسە، وتم: ناوم بێژەنە خەڵکی ئەمشارە نیم چوار رۆژە هـاتوم بـۆ ئێـرە، لەوەڵامـدا تـەنها زەردەخەنەیـەکی کـرد، پـاش چـەند خولـەکێك رۆیـشتن بـەڕێگادا گەیـشتینە مـاڵێکی بچوك کـەلێی دەژیـا، درەختێکی بـەرز سێبەری بۆ خانوەکە دروست کردبوو لقێکی بچوکی

لەئاسماندا دەهاتن و دەچوون.

ەکەوتبوە سەر دیواری خانوەکە باڵندە دەریاییەکان لەئاسماندا دەهاتن و دەچوون.

نێرگس بەهێواشی دەرگای ماڵەکەی کردەوە و هەردوو بەهێواشی چوینە ژورەوە لەناو ماڵەکەیاندا کومبارێکی بچوک راخرابوو لەگۆشەیەکی ماڵەکەدا عەلادینێك بەدی دەکرا جگە لەچەند قاپ و دەوریەك هیچی تری لێنەبوو، پیرەژنێك لەگۆشەیەکی کەلاوەکەدا دانیشتبوو لەدەورو پشتیدا چوار منداڵی بچوك یاریان دەکرد نێرگس بەپەلە چوە پێشەوە و وتی: دایکە نەمتوانی گۆزەکە هەڵبگرم تائێرە ئەم کوڕە کەناوی بێژەنە هەڵیگرت بۆم تائێرە، دایکی بەدەنگێکی لاوازەوە وتی: نێرگس برۆ بۆلای هاوسێکان بۆئەوەی کەمێك پارە قەرز بکەیت منداڵەکان زۆریان نێرگسیش لەوەڵامدا وتی:

دایکە داوای قەرزم لەدراوسێکان گشتی کردووە بەڵام هیچیان پێیان نەدام ئەودراوسێیانەمان تازە هیچکامیان قەرزمان نادەنێ وادەزانن قەرزەکانیان پێنادەینەوە. دایکی نێرگز دوبارە وتی:

ئێستا چاکتر وایە دوبارە برۆیتەوە و بڵێیت دایکم وتویەتی: هەرچۆنێك بێت پارەکەتان دەدەینەوە ئێستا دەستمان تەنگە، یارمەتیمان بدەن. نێرگس لەوەڵامدا وتی:

دایکە دڵنیام ئیتر پارەمان پێ نادەن مەگەر لەبیرت چوەتەوە دوێنێ هەمویان هاتبون بۆماڵمان و داوای پارەکانیان دەکردەوە. بەڵام دایکی نێرگس لەقسەکەی نێرگس ناڕەحەت بوو وتی: نێرگس گیان برۆ تکایان لێبکە و بڵێ چەندرۆژێك یارمەتیمان بدەن تا منداڵەکانمان لەبرسا نەمرن. لەم کاتەدا نێرگس بەتوڕەییەوە هاواری کرد: دایکە رۆیشتن بۆلایان بێکەڵکە ئەم بەیانیە لەماڵ رۆیشتمە دەرەوە هەمویان

گاڵتەیان دەکردو دەیان ووت: دایکی نێرگس پارەی خەڵکی دەخوات، بەگریان و پاڕانەوە پارە قەرز دەکات و هیچ کات نایداتەوە.

پاش ئەم قسانە چەندساتێك بێدەنگ بوون، پاشان دایکی نێرگس روی تێکردم و وتی: کوڕەکە لەخەڵکی ئەمشارە ناچیت چۆن تائێستا تۆم لێرە نەدیوە؟ وەڵامم دایەوە بەڵێ خەڵکی ئەمشارە نیم و تازە بۆئێرە هاتوم لەوکاتەدا نوزەی منداڵێك بەرەو دواوە گەڕاندمیەوە منداڵێکی (٦) ساڵانەبوو، بەئارامی پرسیم: ئەم منداڵە نەخۆشە وابەوشێوەیە دەکوڕزێتەوە.

دایکی نێرگس لەکاتێکدا چاوەکانی پڕ فرمێسك بوو وتی:

نەخێر ئەوە لەبرساندا دەکوڕزێتەوە، ئیتر نەمتوانی ئەو دیمەنە دەردناکە تەماشا بکەم بەپەلە لەکەلاوەکە هاتمە دەرەوە روخساری نێرگس و دایکی خولەکێك لەبەرچاوم دورنەدەکەوتنەوە، بۆ هەرشوێنێك دەڕۆیشتم روخساری ئەو چوار منداڵە بێتاوانەم دەکەوتەوە بەرچاو واملێهاتبوو هیچ کەسێك و هیچ شتێکم نەدەبینی هاتوچۆی مرۆڤەکانم نەدەبینی دەنگی ناڵە ناڵی ئەومنداڵە لەگوێمدا دەزرنگایەوە.

بەئارامی بەڕێدا دەڕۆیشتم چاوەکانی نێرگس دەکەوتەوە بەرچاوم بەپەلە دورکەوتمەوە لەوێ بۆئەوەی کەمێك ئارام ببمەوە، بەپەلە خۆم گەیاندەوە قەراغ دەریاچەکە، ژنان و پیاوان مەلەیان دەکرد لەئاوەکەدا، ئەو منداڵانەی بەخۆشحاڵیەوە یاریان دەکرد دەیانخستمەوە یادی نێرگس و دایکی کەلەکەلاوەکەیاندا بەدبەخت و بێچارە لەبیری رێگاچارەدان.

بەوشێوەیە لەقەراغ ئاوەکەدا دەڕۆیشتم رێم کەوتەوە لای ئەو ژن و پیاوەی باسی ڤیلایان دەکرد هێشتا هەرباسی ڤیلا و ئۆتۆمبیلیان

دەکردلەناکاو سەعاتێکی ئاڵتونیم لەدەستی ژنەکەدا بینی یەکسەر لەجێگای خۆمدا وەکو بزمار چەقیم نەمدەتوانی بگەڕێمەوە نەمدەتوانی بڕۆم، بەئارامی لەنزیکیانەوە دانیشتم بۆئەوەی بەهەرشێوازێك بووە ئەو سەعاتە بدزم. لەوکاتەدا دزیم بەکارێکی شەرەف مەندانە دەزانی.

چەندساتێك تێپەڕی، ژن و پیاوەکە هەر سەرگەرمی قسە کردن بوون، پاش نیوسەعات سەعاتەکەی لەدەست داکەند و روی کردە پیاوەکە و وتی: ئەم سەعاتە بگرە بابڕۆم تۆزێك مەلەبکەم و پاشان بڕۆین بۆ ئوتێل، حەزم لەم سەعاتە نەماوە، ئەبێت سەعاتێکی ترم بۆبکریت چونکە مۆدیلی نەماوە. منیش سەرێکم راوەشاند و چەند خولەکێکی تر راوەستام بەڵام بەهیچ شێوازێك نەمدەتوانی سەعاتەکە بدزم کەم کەم خەریك بوو نائومێدببم، لەناکاو پیاوەکەش بەمەبەستی مەلەکرد کەوتنە ڕێ بێ ئەوەی سەرنج بداتە سەعاتەکە وەیان سەعاتەکە لەگەڵ خۆیدا ببات.

منیش چاوەڕوانی هەلێکی وابووم و زۆر بەپەلە سەعاتەکەم هەڵگرت و هەڵهاتم ماوەیەك بۆ فرۆشتنی سەعاتەکە بەرەو ماڵی پیرەژنەکە رۆیشتم کاتێك گەیشتمە ئەوێ شەوداهات خێرا سەعاتەکەم دابە دەستی دایکی نێرگسەوە و وتم: کاتێك لەشارەکەی خۆماندابووم دایکم ئەم سەعاتەی پێدام بۆئەوەی کاتێك بێ پارەبووم بیفرۆشم ئێستا هەر ئەوەم ماوەتەوە پێشکەشی تۆی بکەم.

دایکی نێرگس بەخۆشحاڵیەوە وتی:

بۆچی ئەیبەخشی بەمن؟ خێرا وتم: بیفرۆشە یان لەدوکانێکدا داینێ لەبارمتەیدا پارە وەربگرە بۆئەوەی منداڵەکان لەبرساندا نەمرن.

ئەوشەوە نێرگس و دایکی بەچاوانی پڕلە چیرۆکی ئەردو ڕەنجەوە سوپاسیان کردم ، تائەوساتەش نەمدەزانی لەفیداکاریدا چ چێژێك هەیە. شەو لەکەلاوەکەدا مامەوە، بەیانی پێشنیارم کرد بۆ دایکی نێرگس سەعاتەکە بفرۆشە، پاشان خواحافیزیم کرد و هاتمە دەرەوە پاشان دیسانەوە هاتمەوە قەراغ دەریاچەکە، دەمەو نیوەڕۆ دیسانەوە گەڕامەوە ماڵی نێرگس بۆئەوەی بزانم سەعاتەکەی فرۆشتوە یان نە وەئەگەر نەیان فرۆشتبێت بۆیان بفرۆشم کاتێك گەیشتمە ماڵەکە زۆر بەسەرسامیەوە بینیم دایکی نێرگس لەوێ نیە و منداڵەکانیش دەگرین.

پرسیارم لەنێرگس کرد چی بووە؟ پشتی تێکردم و هیچی نەوت، دیسانەوە پرسیم بۆچی دەگریت؟ وەڵامی دایەوە چۆن تۆنازانیت بۆچی دەگریم؟ وتم ئاخر چۆن بزانم ئێوە بۆچی دەگرین وەڵامی دایەوە و بەتوڕەییەوە وتی ئەزانیت ئەوسەعاتە تۆ دزیوتە و دەیخەیتە گەردنی دایکم، بیر ناکەیتەوە ئەگەر دایکی بێچارەم بخەنە زیندانەوە ئەو منداڵە بێ تاوانانە لەبرسانا دەمرن؟ لەبەیانیەوە تائێستا کەلانتەری بردویانە و هێشتا نەگەڕاوەتەوە رەنگە زیندانیشی بکەن.

وتم چ کەسێك بردویەتی بۆ کەلانتەری؟ ئەمڕۆ بەیانی زوو دایکم رۆیشت بۆئەوەی سەعاتەکە بفرۆشێت ژنێك لەو نزیکانەدا بوە کاتێك سەعاتەکەی بەدەست دایکمەوە بینیوە دەڕاتە پێشەوە و دەڵێت ئەم سەعاتە هی منەو دزیویانە هەرچی دایکم سوێن دەخوات ئەم سەعاتە هی کوڕێکە و بەخشیویەتی پێم باوەڕی پێناکات و دەیبات بۆ کەلانتەری و پێش ئەوەی بیبەن بۆکەلانتەری تکای کرد هەرکاتێك گەڕایتەوە بابەتەکە رون بکاتەوە.

بەبیستنی قسەکانی نێرگس رانەوەستام، بەپەلە هاتمە دەرەوە زۆر گەڕام هیچ کەسم نەبینی دورکەوتمەوە لەماڵ، هەستم دەکرد وەکو گەڵایەکی وشکەوەبووم لێهاتبوو بەسەر ئاوی روبارەوە، پاش گەڕانێکی زۆر بەکۆڵانەکانــدا گەیــشتم بەپۆلیــسێك زۆر بەهێواشــی بــەرەو روی رۆیشتم و وتم: کاکی پاسەوان من دزم دەستگیرم بکە.

پاسەوانەکە گەنجێکی زۆر جوان بوو سەیرێکی سەرو قاچمی کردوو وتی تۆدزیت؟ وەڵامم دایەوە ئەری، پاشان باس و خواستەکەم هەمووی بۆباس کرد، پاسـەوانەکەش کاتێك گوێی لەباس و خواستەکە گرت. وتـی تـۆ هـەمان ئەوکوڕەیت کـە سـەعاتەکەت بەخـشیوە بـە پیرەژنەکـە. بـەیانی ئـەو ژنـە مـن بـردم بۆکەلاتنـەری ئەوبێـچارە لـەڕێگادا پێـی وتم بەخوا ئـەم سـەعاتە کوڕێك پـێ ی بەخـشیوم بـەڵام هیچ کـەس باوەڕی پێنەدەکرد تائەوکاتەی سەرۆکی کەلانتەری ناردی بەشوێن مندا و وتی پێویـستە تـۆ ئـەو کـوڕە پەیدا بکـەیت، من دەرگـا بـەدەرگا بـەدوای تۆدا دەگەڕام چاکت کرد خۆت بەپێی خۆت هاتی کارەکەی منت ئاسان کرد، پاشان لەگەڵ خۆی بردمی بۆکەلانتەری.

لـە کەلانتەریـدا دایکـی نێـرگس بەچـاوی پـڕ لـە گریانـەوە دەیگـووت بەخوا من دز نیم زیندانیم مەکەن منداڵەکانم بـێ سەرپەرشـت دەبن، ئەم سەعاتە ئەو کوڕە دڵسۆزە پێی دام.

لەم کاتەدا پاسەوانەکە بردمیە پێشەوە و روی کردە دایکی نێرگس و وتــی مــەگری ئــەوکوڕەم پەیــدا کــردووە کەســەعاتەکەی پێــداوی و هێناومە بۆ ئێرە،

منــی نیگــەرانیش ســەرم شــۆڕ کردبــوەوە هیــچم نــەوت ئەفـسەری کەلانتـەریش زۆر تورە دەکەوتـە بەرچاو لەسـەر کورسیەکەی قیڕاندی و

وتی هەی هەتیوی بێویژدان دزی دەکەیت و دەیخەیتە گەردنی ئەم پیرەژنە و رادەکەیت ئێستا وەڵامم بدەرەوە بۆچی ئەم کارەت کردوە؟ زووکە وەڵامم بدەرەوە.

کەمێك بەرەو پێش رۆیشتم وتم: جەنابی ئەفسەر هەرگیز مەبەستم نەبوە رابکەم راستە ئەم سەعاتە من دزیومە بەڵام بوار بدە تا پێت بڵێم بۆچی ئەم کارەم کردووە. دوێنێ شە و بەرێکەوت رێم کەوتەماڵی ئەم پیرەژنە پاش ئەوەی بۆم رون بویەوە ئەو پیرەژنە و منداڵەکانی لەبەیانیەوە هیچیان نەخواردووە ، خۆشم پارەم پێ نەبوو یارمەتیان بدەم لەبەر ئەوە کەوتمە بیری دزیکردنەوە سەریش کەوتم، سەعاتێکی ئاڵتونی ژنە دەوڵەمەندێکم دزی ، بەوکارەشم گیانی منداڵەکانی ئەوژنەم لەمردن رزگارکرد. کاتێك بابەتەکەم بەم شێوەیە بیست و تێگەیشتم ئەو پیرەژنە بێ تاوانەتان بەتۆمەتی دزی دەستگیر کردوەخێرا و دەست بەجێ خۆمم ناسان بەپاسەوانەکە و ئەویش هێنامی بۆ ئێرە، ئێستاش لەبەردەستاندام هەر سزایەکم بۆدادەنێن من ئامادەم.

ئەفسەرەکە بەبیستنی قسەکانم سەری شۆڕ کردەوە و ئەوانەی تریش کەلە کەلانتەی دابوون بەسەر سامیەوەسەیریان دەکردم، خاوەن سەعاتەکەو دایکی نێرگسیش لەگۆشەیەکدا راوەستابوون و مات و بێدەنگ سەیری منیان دەکرد، پیاوێکی کورتەباڵاش وادەردەکەوت بەتاوانی دزیەوە دەستگیر کرابێت بەسەرسامی یەوە دەستی کرد بەگیرفانیدا و پەنجا تمەنی دەرهێنا و دایبەدەستمەوە.

پرسیم ئەم پارەیە بۆچی دەدەیت بەمن؟ وتی: لەبەر ئەوەی لەتەواوی تەمەنمدا مرۆڤێکی وەکو تۆ فیداکارم نەبینیوە تۆ بەپێی خۆت هاتی بۆ

نێرە و ووتت ئەم سەعاتە من دزیومە و گیانی ئەو پیرەژنەت رزگار کرد، منیش وتم کارێکی گرنگم نەکردووە تەنها ئەرکی خۆمم بەجێهێناوە و پاشان پەنجا تمەنەکەم لەدەست وەرگرت و دام بەدەست دایکی نێرگسەوە و بەسەر سامیەوە پرسی ئەوپارانە دەدەیت بەمن؟ وەڵامم دایەوە بەڵێ من پێویستم پێی نیە بەڵام تۆ دەتوانی قەرزەکانی پێ بدەیتەوە. ئەوانەی لەوێدابوون هەموویان سەرسام بوون لەو کارەی من، ژنەی خاوەن شکاتیش پەشیمان بویەوە لە شکاتەکەی. لەبەر ئەوەی سەعاتەکە گران بوو ئەفسەرەکە روی کردە من و وتی تۆ دز نیت ئەمە کارێکی شەرافەت مەندانە بووە تۆ کردوتە بەم کارە ناکرێت بڵێین دزی، بەڵام بەلای یاساوە بەتاوان دەژمێردرێت لەبەر ئەوەش بەوپەڕی نیگەرانیەوە دەبێت بڕۆیت بۆ دادگا.

دایکی نێرگس کاتێک ویستی بڕوات گەڕایەوە دواوە و چەندخولەکێك سەیری سەرەپا روخساری کردم و لەژێر لێوەوە وتی ئەگەر دوێنێ شە و تۆ فریای منداڵەکانم نەکەوتیتایە ئێستا هەموویان لەبرسانا مردبوون، ئەمڕۆش منت رزگارکرد لەتۆمەتی ناڕەوا، پاش ئەم قسانە کەلانتەری بەجێهێشت و گەڕایەوە ماڵەوە.

منیان خستە ناو زیندانی کاتیەوە تا بەرەو دادگا بڕۆم و سەرەنجام روون ببێتەوە: رۆژی دوایی پاسەوانێك هاتە زیندانەکە و لەگەڵ خۆیدا بردمی بۆ دادگا، کاتێك ویستم لەزیندان بێمە دەرەوە دەستبەندێکی ئاسنی قورسی ئاڵاند بەدەستمەوە، پاشان بەرە و دادگا رۆیشتین. کاتێك گەیشتینە دادگا چاوم بە پەیکەرێك کەوت تەرازویەکی بچوکی بەدەستەوە بوو. لەبەر خۆمەوە وتم رەنگە ئەم پەیکەرە پەیکەری داد بێت، هەر واش بوو.

لەهۆڵی دادگا چەندکورسیەك هەبوو، ژمارەیەکی زۆری خەڵك لەسەری دانیشتبوون لەگەڵ یەکدا قسەیان دەکرد، لەلای راستدا قازی لەشوێنی خۆی راوەستابو، سەرۆکی دادگا لەنێوان هەمویاندا ئاشکرابوو دادگستریش لەشوێنی خۆیدا دانیشتبوو پەیکەری دادیش لەژور سەریەوە بەدیوارەکەدا هەڵواسرابوو. کاتێك چومە پێشەوە بۆئەوەی لەشوێنی تاوانبارانداا رابوەستم لەناکاو نەفەرێك لەنێوان دانیشتوانەکاندا هاواری کرد و وتی: دزەکەیان هێنا بەڕاستی هەر لەدزیش ئەچێ ئەوەی لەتەنیشتیشی دانیشتبوو وتی هەر لەپیاو کوژیش دەچێت، من بە روخسارێکی ناشیرین و جل و بەرگێکی دڕاو و قژێکی درێژەوە بەهۆڵی دادگادا رۆیشتم بۆجێگاکەی خۆم واتە جێگای تاوان باران.

پیاوێکی گەنج لەنزیکمەوە دانیشتبوو، بەئارامی وتی کوڕەکەگیان بۆمان باس بکە بۆچی دزیت کردووە؟ چونکە من پارێزەری تۆم باس و خواستەکەم بەئارامی بۆ پارێزەرەکە گێڕایەوە و ئەویش بەناڕەحەتیەکەوە وەڵامی دایەوە دزێکی زۆرچاکیت و پێویستە لەم دادگایەدا باست بکرێت.

من دزم کارێکی ناڕەواو ناپەسەندم کردووە جێگای قێز و بێزی کۆمەڵگایە خۆم لەوتۆمەتە دورناخەمەوە بەباشی هەست دەکەم ئەبێ دزم تەمێ بکرێم، تەماشای رق و کینی دانیشتوان لەهەمولایەکەوە بەڕەوا دەزانم، رقیان لێمە قسە ناشیرینەکانی دانیشتوانم هەموو گوێ لێبوو بەلام ئایا لەم کۆمەڵگە گەورەیەدا تەنها من دزم؟ ئەوخەڵکەی تر هەمویان کەسانی چاك و رەوشت بەرزن؟ ئایا بەتەمێ کردنی من ئیتر کۆمەڵگا رەوشت بەرز و بێ نەگ دەبێ؟ ئاخر من لەکوێوە تێکەڵاوی ئەم

ڕەوشتە پیسە بووم؟ ئایا من بەپیسی لەدایك بووم ئەم ڕەوشتە پیسە هەر لەسەرەتای لەدایك بوونمەوە لەگەڵ مندا لەدایك بووە بەڵام لەکاتی منداڵیمدا منداڵێکی بێتاوان بووم و لەچاکی و خراپییەکانی ئەم دونیایە هیچم نەدەزانی، دەی کەواتە چۆن بوو لەناکاو فێری دزی بووم؟

گەرچی بەپلەی یەکەم خۆم تاوان باربووم بەڵام کۆمەڵگاش بەشی لەتاوانەکەدا هەیە ئەویش وەك من ئالودە و نەنگینە ئەی بۆچی لەناو ئەو هەموو نەنگی و بەد ڕەوشتیەدا تەنها من سەرزەنشت دەکرێم؟

پاش ماوەیەك سەرۆکی دادگا دەستی نابە زەنگەکەدا و بەدەنگێکی بەرز وتی تاوان بار خۆی بناسێنێت بەپەلە هەستامە سەرپێ و وتم: ناوم بێژەن بێ باوك، بێ کەس و بێ سەرپەرشت، بێ شوێن و ڕێ و پاشان دوبارە لەسەر کورسیەکە دانیشتم.

دادوەر یەکسەر هەستایە سەرپێ و سەیرێکی کردم دەیویست بزانێت چۆن بتوانێت دارکاری منداڵێکی (١٥) ساڵانە بکات، دەستەی دادوەران وایان دەزانی ئەڕە شێرێکی برسی ترسناك دادگایی دەکەن. لەم نێوەندەشدا من بچوکترین ترسم نیشان نەدا، دادوەر بێ ئەوەی بچوکترین زانیاری دەربارەی من هەبێت بەدەنگێکی بەرز هاواری کرد:

ئەی دادوەران ئەم بێژەنە دزێکی کۆنە و بەدزینی سەروەتی خەڵکی بژێوی خۆی پەیدا دەکات ئەم هەتیوە دزکی کۆمەڵگایە ئەم هەتیوە دزکێکی ترسناکە پێویستە دارکاری بکرێت بۆئەوەی ببێتە پەند بۆ بێژەنە هاوشێوەکانی، ئەو کۆمەڵگایەی بێژەنی لەم شێوە لەخۆ بگرێت دوچاری چەرمەسەری دەبێت.

هەرچۆنێك بێت دادوەر بەوپەڕی دڵ ڕەقی تۆمەتی زۆری دایە پاڵم، منی بەدزێکی سەرسەخت دالەقەڵەم. پاشان سەرۆکی دادگا وتی با

تاوان بار بەرگری لەخۆی بکات و نوسەری دادگاش ئەوەی دادوەر کەوتی هەمووی نوسی، پاشان پارێزگارەکە هەستایە سەرپێ بۆئەوەی بەرگریم لێ بکات، بەدەنگێکی بەرز وتی: بەڕێزان ئەم منداڵە هێشتا تەمەنی نەگەیشتوەتە تەمەنی یاسایی هێشتا بەباشی نازانێت ماناى دزی چی یە و لەڕوی نەزانیە وە ئەم کارەی کردووە و ئێستاش پەشیمانە پاش قسەکانی لەسەر کورسیەکە دانیشت.

لەم کاتەدا سەرۆکی دادگا وتی تاوان بار با دوابەرگری لەخۆی بکات، بەئارامی هەستامە سەرپێ لەبەر سەیرکەرانی ناو هۆڵەکە دەلەرزیم تەنها سەیری پەیکەری دادگام دەکرد چونکە تەنها ئەو ئەتوانێت لەقسەکانم تێبگات گەرچی رۆح و گیانی تیا نەبوو بەلاَم زۆرچاکتر لەم مرۆڤە دڵ رەقانە تێدەگات.

زەمانە و ئەو رەنجە زۆرەی کەکێشابووم وەك پۆلایان لێکردبووم و لەهیچ شتێك نەدەترسام بەدەنگێکی لەرزۆکەوە وتم ئاغای دادوەر راستە من دزم و دزیم کردوە وە دەشزانم ئەم کردارەم چەندناشیرین و نارەوایە و کۆمەڵگاش قیزی لێدەکاتەوە بەلاَم لەوەی کردوومە پەشیمان نیم.

تۆ منت بەدزێکی راستەقینە و بێویژدان ناسان لەکاتێکدا من بۆ سکە بەتاڵەکەی خۆم دزیم نەکردووە ئەو شەوە چومە ماڵی ئەو پیرەژنە بچوکترین منداڵی ئەو پیرەژنە تەمەنی شەش ساڵان بوو لەبرساندا دەکوڕوزایەوە فرمێسکەکانی ئەو منداڵە بەرچاوی رەشکردم و لە مرۆڤی راستەقینە دەرچووم و بیرم لەکردارەکەم نەکردەوە دەنگی ناڵە ناڵی ئەومنداڵە لەهەموولایەکەوە دەبیسترا تۆ نازانیت من چیم دیوە و چ هەستێکم بووە، ئاغای دادوەر تۆش منداڵت هەیە والەبەرچاو بگرە

منداڵەکانت بۆ پارویەك نان لەبرساندا دەگرین بیر بکەرەوە لەوساتەدا تۆ چ بیرێك دەکەیتەوە؟ چ منداڵی تۆ و چ منداڵی ئەو پیرەژنە هیچ جیاوازیەکیان نیە هەردوکیان هەر منداڵن، من چەند منداڵێکم لەبرسیەتی رزگار کرد بیر بکەرەوە ئەگەر ئەومنداڵانە هی تۆبونایە ئەوکاتە سەرزەنشتت دەکردم؟

لەوکاتەدا هیچ چارەیەکم نەبوو ئایاتۆ هیچ ڕێگە چارەیەکی تر دەزانیت؟ من بەو کردارەم پێم دەوترێت دز، گیانی چەند کەسێکم سەندەوە بەو کردارە ناشیرین و ناڕەوایە گیانی چەند منداڵێکم سەندەوە لەوساتەشدا کە دزیەکەم کرد خۆمم بەمرۆڤێکی تەواو دەزانی لەوکاتەدا دزی کردنم بەکارێکی شەرافەت مەندانە دەزانی حەقیقەتەکەش هەر ئەوەبوو. گەرچی ئەم کردارە بوەتە جێگای رق و کینەی کۆمەڵگا و بە زەهری کۆمەڵگای دەزانن. لێتان دەپرسم ئەو زەهرە ترسناکە کێ دروستی کردووە، من شەرمەزاری کۆمەڵگام دانی پێدا دەنێم بەڵام کۆمەڵگای نەنگ و شەرمەزار منی هێناوەتە دونیاوە ئاخر لەکۆمەڵگایەکدا کە هیچ گوڵێکی لێ نەڕواوە چۆن چاوەڕوان دەکرێت لەنێوان ئەو هەموو دڕك ودالەدا من گوڵێکی جوان خۆش بۆبم لەکۆمەڵگا دورم مەخەنەوە تەنها من تاوان بار نیم گەرچی بەتەنها من لەپشت مێزی دادگادا راوەستاوم و تەمێم دەکەن.

لەبەر ئەوەش ناتوانی دزێك تاوان بار بکەیت بەدز مەبەستی دزی کردنەکەی خزمەتکردن بێت بە کۆمەڵێك منداڵی برسی. دادوەر تۆش مرۆڤیت مرۆڤێکی خوێنەواری، نابێت لەخۆتەوە بڕیار دەرکەیت و خەڵکی سەرکوت بکەیت. پاڵپشتی کردنی کۆمەڵگای پیس و تاوان بار کارێکی نامرۆڤانەیە پاشان لەسەر کورسیەکە دانیشتم.

هەموان بەقسەکانم نارەحەت بوون، ئەو کۆمەڵەی لەوەو پێش بەرقەوە سەیریان دەکردم هەموویان سەریان شۆڕکردبوەوە لەبەر خۆیانەوە دەگریان سەرۆکی دادگاش بەچاوی پڕ لە فرمێسکەوە زەنگی پشوی دا.

پیرە پیاوێکی خەمبار و بەساڵاچوو بەپشتی چەماوەوە هەستایە سەرپێ و بەدەنگێکی بەرز وتی: سەرۆکی دادگا من سەد تومەن دەدەم بەبێژەن. ئەو سەرمەشقی مرۆڤایەتیە، راچڵەکێنەری ویژدانی خەفەکراوە، ئەو کەسێکە پێویستە رێزی لێ بگیرێ. لەبەر ئەوەی پشتیوانی مرۆڤایەتیە و راستی دەوێت، ئەو دزی کۆمەڵگا نیە بەڵك و گوڵی نێوان ئەم دۆزەخەیە، ئەو ژەهری ترسناکی کۆمەڵگا نیە بەڵك و ئەوهاتوەتە دونیاوە بۆئەوەی زەهری کۆمەڵگا لەناو بەرێت ئەو کەسێکە لەسەروی مرۆڤەوەیە، نابێت سەرزەنشت بکرێت، ئەبێت رێزی لێبگیرێ ئەو کەسێکە لەوپەڕی هەژاری و بەتبەختیدا ژیان بەسەر دەبات و لەبەر خۆی و لەبەر هەژاری خۆی دزی نەکردووە، بەڵکو لەبەر هەژارانی تر دەستی بە دزی کردووە، ئەو مرۆڤێکی سەربەرزە پێویستە بکرێتە پێشەوای کۆمەڵگا، پێویستە پشتیوانی لێ بکرێت، ئەو بەجل و بەرگە شڕو بەو رەنگە زەردهەڵگەڕاوەی جێگای شانازی ئێمەیە و پاشان پیرە پیاوەکە لەجێگای خۆیدا دانیشت.

پاشان ژنێکی تاڕادەیەك گەنج هەستایە سەرپێو وتی:

سەرۆکی دادگا منیش (٥٠) تمەنم هەیە ئەمەوێت بیدەم بەوکورە. پاشان سەرۆك دادگا وتی بێژەن تۆ ئەوپارانەت دەوێت؟ وەڵامم دایەوە: بەڵێ لەبەر ئەوەی دەمەوێت لەزیندانەدا بخوێنم و پێویستم بەپێداریستیەکانی خوێندنە.

لەم کاتەدا خەڵکەکە ئەوەندەی تر ناڕەحەت بوون سەرۆکی دادگا تائەوکاتە بەئارامی لەسەر کورسیەکەی دانیشتبوو هەستایە سەر پێ و وتی: بێژەن تۆ خوێندەواریت هەیە؟ وەڵامم دایەوە: بەڵێ من پێشتر قوتابی بووم و تاپۆلی دووەمی ناوەندیم خوێندووە ئێستاش ماوەیەکە دەربەدەری سەرشەقامەکانم و تا لەکۆتایدا فێری دزی کردن بووم.

پاشان دادگا دەستی کرد بەلێکۆڵینەوە یەکساڵ زیندانی بۆ بڕیمەوە و سەعات (١٠)ی بەیانی دووپۆلیس منیان خستە زیندانەوە زۆر ناڕەحەتیش نەبووم لەبەر ئەوەی ئەو ئازادیە سەرتاسەر نەنگی و شەرمەزاریەم بەهیچ دەزانی، لەبەر ئەوەی لەسەر شەقامەکاندا ڕۆژ هەتا ئێوارە دەرگا بەدەرگا بەدوای پارویەك ناندا دەگەڕام.

ئەو یاسایەی یەکساڵ زیندانی بۆ بڕیمەوە ناتوانێت ڕێنمونی کەری مرۆڤایەتی بێت ڕاستی نیشانی خەڵکی بدات، دەڵێن یاسا کەڕ و کوێرە وەلە کەڕو کوێریش هیچ چاوەڕوانیەك ناکرێت کە بتوانێت خۆشبەختی کۆمەڵگا دابین بکات.

## بەندی دووەم

ڕۆژی یەکەمی زیندان دیوارە بۆر و زبرەکەی هەموو لەشمی بریندار دەکرد، زیندانەکانی ئاوی وەکو مردویەکی بەشی زیندوخۆر بوون تەنها لەجوڵەکانیاندا دەتزانی زیندوون.

هیـچیان بـۆنی خۆشـبەختیان نەچەشـتبوو، هیـچیان دەربـارەی مرۆڤایـەتی نـەدەزانی، تـەنها بیریـان لـە خراپـەکاری دەکـردەوە. کاتێـك زیندانیەکان زانیان پێم دەورەیان لێدام یەکێکیان پرسی لێم چەندساڵ حوکمی؟

وەڵامم دایەوە یەك ساڵ.

یەکسەر زیندانەکانی دەوروپشتم دایانە قاقای پێکەنین و یەکێکیان وتی:

یەك ساڵ حوکم هیچ نیە من پێنج ساڵ حوکم دراوم، پاشان یەکێکی تریان پرسی: باشە بۆچی زیندان کرایت؟

وتم: لەبەر ئەوەی دزیم کردووە.

زیندانیەکی تر پرسی: چیت دزی؟ چیت لەپارەکە کرد؟

ئـیتر نـەمتوانی راسـتیەکەیان بـۆ رون بکەمـەوە لەبەرئـەوەی هـەر لەسەرەتای بینینیانەوە هەستم کرد نیشانەی شەرەف ویژدان پێیانەوە دەرناکەوێت لەبەر ئەوەی ئەوەندە ئازاری ئەم ژیانەیان چەشتبوو دڵیان وەك بەرد و مێشکیان وەك ئاسنی لێهاتبوو.

وتم: سەعاتی ئاڵتونم دزی، لەکاتی فرۆشتنیدا دەستگیریان کردم.

پاشان یەکێکی تریان وتی: ئەگەر پارەت پێیە وەرە با قومار بکەین لەبەر ئەوەی یەکەم ڕۆژتە ئەزانم زۆر بێتاقەتی، چارەسەری ئەوبێزاریەت تەنها قومارە، تەنها ئەوقومارەیە ئەتوانێت خەیاڵت ئاسودە بکات ئەگەر قومار نەبوایە کێ دەیتوانی لێرە ژیان بەسەر بەرێت.

لەناکاو یەکێکی نەفامیان هاتە بەردەمم و راوەستاو وتی چۆن قومار نازانیت رەنگە یەکەمجارت بێت زیندان کرابیت، ها؟

بەئارامی وتم: بەڵێ یەکەمجارمە زیندان دەکرێم.

پاشان یەکێکیان وەڵامی دامەوە و وتی: نیگەران مەبە فێری قومار و گیرفان بڕینیش دەبیت.

یەکسەر وتم: نەحەزم لە قومارە و نە لەگیرفان بڕینیش، وەلەوکاتەدا هەمویان دەورەیان دام و دەستیان کرد بە پێکەنین.

یەکێکیان وتی:ئەم برادەرە ئەتوانێت فێری گیرفان بڕینت بکات، براگیان پێویستە فێری گیرفان بڕین ببیت چونکە بەکەڵکت دێت و دەبێت زۆریش پێت خۆش بێت و ئەبێت (٣) تمەنیش بدەیت تافێرت بکات چونکە هونەرێکی دەرامەت دارە کاتێک لەزیندان بەربوویت بەلایەنی کەمەوە تۆ پێویستت بە هونەرێك هەیە بۆئەوەی وێڵگەرد بەشەقامەکاندا نەگەڕێیت.

من هیچ وەڵامم نەدایەوە چون هەموویان یەکیان گرتبوو دەیانویست لێم بدەن لەبەر ئەوەی تازە هاتبووم بەنامۆ تەماشایان دەکردم وەئەگەر دەم درێژیم بکردایە دەیان تۆپاندم لەبەرئەوەش بێدەنگ بووم، پاشان بڵاوەیان لێکرد.

کۆمەڵگا هەموو ئێمەیان بەرکردبوو هەموویان ئێمەیان خستبوە ناو ئەم گۆڕستانە ناخۆشەوە بۆئەوەوی پەند وەربگرین و دەست لەوکردارە ناشیرینانە هەڵبگرین لەکاتێکدا زیندانەکە خۆی شوێنی خراپەکاری بوو رەوشتی ناشیرین، بەدئەخلاقی ئێمەی، زیاد دەکرد ئێمەی بێرەحمتر و بێ ویژدانتر و نابوت تر دەکرد.

کۆمەڵگا هەموو ئێمەیان دروخستبوەوە و خستبوینانە نێو چاڵێکی رەشەوە بۆئەوەی رزگاریان بێت لەکردارمان لەکاتێکدا نەیاندەزانی رۆژێك کەرزگارمان بێت دوبارە دەگەڕێینەوە ناو کۆمەڵگا ئەمجارەیان خراپتر و بێرەوشت تر بەنێوانیاندا دەگەڕێین.

ئەورۆژەی بەهەموو نارەحەتیەکانیەوە تەواو بوو شەویش لەدوور هەموویانەوە خەوتم بەیانی ڕۆژ بویەوە زوو لەخەو هەستام بەلام دەمویست شیشە ئاسنەکانی زیندانەکە لەبندا هەڵ بکەنم بەلام توند و تۆڵی دەرگای زیندانەکە و چڕو چاوە عەبوسەکەی پاسەوانەکە پاشگەزی کردمەوە، هیچ ڕێگایەکی دەربازبوونم نەبوو.

ماوەیەك تێپەڕی، زیندانیەکان هێدی هێدی دەهاتن بۆلام و لەگەڵم دەبوون بەئاشنا. لەزیندانەدا هەمووشتێك لەگەڵ دەرەوەدا جیاوازبوو سەرگوزەشتەکانی زۆرجیاوازبوون و نەمدەتوانی تەحەمولی بکەم بەلام هەندێکجار لەبەر دۆستەکانم گوێم لێدەگرتن، ئەوانیش سەرگوزەشتەکانیان وەکو من وابوون.

ئەحمەد یەکێك بوو لە هاوڕێکانم و تەمەنی (١٥) ساڵ بو هەمیشە پێی دەوتم شەش مانگە لێرەم، بێژەن باسی دەرەوەم بۆبکە باسی خەڵکی تەلار و کۆشکەکان، هەرچی دەزانی باسی بکە بۆم ئەم زیندانە نابوتی کردووم هەرکات لێم بپرسایە بۆچی زیندانیان کردوویت؟ خێرا

وەڵامی دەدامەوە: بیزۆن هیچم بیرمەخەرەوە بیرخستنەوەی رابردووم ناڕەحەتم دەکات.

حەسەنیش یەکێك بوو لەهاوڕێ خۆشەویستەکانم و زۆربەی کاتەکان پێکەوەبوین شەوانیش لەنزیك حەسەن و محمدەوە دەخەوتم محمدیش هاوڕێیەکی بێدەنگ لەسەرخۆ بوو هەرچەندحەسەن شۆخی زیاتری بکردایە محمد ئارامتر و بێدەنگتر دەبوو.

حەسەن نزیکەی بیست و پێنج تمەنی هەبوو هەمووشەوێ کاتی خەوتن دەیژماردن و لەژێر سەرینەکەی دایدەنان، کردبووی بەبەرنامەی شەوانەی خۆی، ئەگەر شەوێك لەبیری بچوایە پارەکانی بژماردایە هاوڕێکانی گاڵتەیان پێدەکرد، دەیان وت خێرە وائەمشە و لەبیرت چوە پارەکانت بژمێریت، ئەویش خێرا دەستی دەکرد بەگیرفانیدا و پارەکانی دەردەهێنا و دەیژماردن. حەسەن لەهیچ کەس دڵنیا نەبوو تەنانەت لەمنیش هەرچەندە هاوڕێی دڵسۆزی یەکتر بووین لەوە دەترسا پارەکانی ببەین.

بەرۆژدا هەندێ لەزیندانەکان سەرگەرمی قومارکردن دەبوون هەندێکی تریشیان لەگۆشەیەکدا بەزەنگیانە سەرگەرمی دروستکردنی کیفی ژنانەبوون، ئەوانەی تازە هاتبوونە زیندانەوە و هونەری گیرفان بڕی فێر نەبووبوون بەبڕێك پارە خۆیان فێری ئەوهونەرە دەکرد شەوانیش هەریەکە دەچوە گۆشەیەکەوە و بەبێدەنگی لێی دەخەوت.

زۆربەی کات زیندانەکان باسی محمودیان دەکرد لەبەرئەوەی زۆر کەسێکی بێدەنگ بوو، نقەی لەگەڵ کەس نەدەکرد و کاتێك نانیان دەهاورد بۆمان هەمومان پێکەوە گەورە و بچوك هێرشمان دەبرد زۆردیمەنێکی سەرسامی دەبوو بەڵام محمود تەنها کەسێك بوو

لەنێوانماندا لەگۆشـەیەکدا بێـدەنگ دادەنیـشت و لـەدوای هەموویانـەوە خواردنی وەردەگرت.

ئـەو لەهـەموو زیندانـەکان جیـاوازتربوو وەکـو یـەکێکی گۆشـەگیر دەهاتـە پـێش چـاوم کەسـیش نەیـدەزانی محمـود بیر لەچی دەکاتـەوە. چەندین جار چوم بۆلای بەڵکو باسێکی رابردووی خۆیم بۆبکات بەلام خێرا هەڵدەسایە سەرپێ و جێی دەهێشتم بۆئەوەی قسەم لەگەڵ نەکات هیچ کات تێکەڵاوی کەسی نەدەکرد.

حسن هەندێجار پێـی دەوتم شەوانە لـەلای محمـود دا دەخـەوم هـەتا بـەیانی دەتلێتـەوە لەبـەر ئـەوەی ئەوەنـدە لەسـەر قەرویڵەکەیدا وڕاوە و وڕێنە دەکات ئیسراحەتم لـیَ تێك دەدات نازانم لەبەر چ هۆیەکەوەلـەلای منـەوە دەخـەوێت لەوانەشـە لەبـەر ئـەوەبێت بیـەوێت بیـست و پێـنج تمەنەکەم لیَ بدزێت.

حـسن تاقـەتی لـە محمـود نـەبوو، وایـدەزانی دەیـەوێت پارەکـەی لێبدزێت. کوڕو کاڵەکان زۆر سەریان دەنایە سەر حسن، ئەحمد زۆرجار دەیووت تۆبۆچـی ئەوەنـدە پـارە خۆشەویستی، پێـنج مانگە تۆ شـەو و رۆژ ئەم پارەیەت ئەژمێری، عەباس حەقدە ساڵان بوو وەکو نەفام قسەی دەکرد و دەیوت حسن دەبێت ئەوپارەیەت لیَ بدزین ئەترسم تا قیامەت هـەڵی بگریـت وەرە قومارێکـت لەگـەڵ بکـەین لەبەرئـەوەی لەوپارەیـە دەست بـەردار ببیـت، بـەڵام حـسن حـەزی لـەقومار نـەدەکرد چـون لـەوە دەترسا پارەکەی بدۆڕێنێ.

رۆژێکیـان هەنـدیَ لـەهاوڕیَ یـان هـەوڵیان دا بەمەبەسـتی شـۆخی کردنـەوە پارەکـەی لـیَ بـدزن شـەوێکیان کاتێـك هـەمومان لەشـیرینی خـەودابووین عـەباس ناخـەوێت و پارەکـەی حـسن لـەژێر سـەیرنەکەیدا

دەردەهێنێت و لەلای خۆی دەیشارێتەوە، بەیانی کاتێك حسن لەخەو هەڵدەستێت هەروەك پیشەی خۆی سەرینەکەی بەرز دەکاتەوە سەیرەکات پارەکەی دیارنیە، بەپەلە دێت بۆلای من و دەڵێت محمود پارەکەی منی دزیوە.

منیش هیچ زانیاریەکم دەربارەی نەبوو وەنەشم زانی عەباس بەشۆخیەوەپارەکەی لێ شاردەوەتەوە، وتم باوەڕناکەم محمود کاری وابکات وەئەگەر باوەڕیش بەمن ناکەیت چاك وایە خۆی خەبەر بکەیتەوە و لێی بپرسی.

حسن بەپەلە محمودی خەبەر کردەوە و بەتوڕەییەوە وتی: زوکە پارەکەم بدەرەوە ساختەچی بۆچی پارەی من دەدزیت؟

محمودی بێ ئاگا بەڕەنگێکی زەرد هەڵگەڕاو و روخسارێکی خەمناکەوە لەخەو راپەڕی و وتی لەخۆتەوە بوختان مەکە بەرامبەرم من ئاگام لێی نییە.

لەوکاتەدا دیسانەوە حسن هاواری کردەوە و وتی پارەکەم بدەرەوە ئەی دزی خوێڕی ئەگەر پارەکەم نەدەیتەوە بەمشت تێت بەردەبم وامەزانە بتوانیت وەکو خەڵکی فێڵم لێبکەیت.

محمود بەئارامیەکەوە وتی لەوانەیە کەسێکی تر پارەکەی لێشاردبێتیتەوە خۆمن دزنیم پارەی تۆم بۆچی یە.

حسن زۆر لەقسەکانی محمود نارەحەت بوو، وتی: تۆ لەهەموومان دزتری چونکە ئێمە لەدەرەوەی زیندان دزیمان کردبێت تۆ لەناو زیندانیشدا دزی دەکەیت، زوکە خێرا پارەکەم بدەرەوە ئەگینا هەرچیەکت لێ بێ تاوانەکەی لەگەردنی خۆتە، لەبەر ئەوەی محمود هیچ وەلامێکی حسن ی نەدایەوە چەندجارێك بەمشت کێشای بەچەناکەی

محمود دا و حسنی بەزەویدا لەوکاتەدا بەپەلە رۆیشتم بەرەو حسن و وتم:

ئەمە چ کارێکە تۆدەیکەیت لەوانەشە ئاگای لێی نەبێت. نابێت بەوشێوەیە رەفتاری لەگەڵ بکەیت، چاکتروایە بەزمانی شیرین رەفتاری لەگەڵ بکەیت ئەگەر پارەکەتی بردبێت پارەکەت دەداتەوە ئەم رەفتارەت ناشیرینە سەیرکە چەند رەنگ زەرد و لاوازە کەمێک بەزەیت پێیدا بێتەوە.

لەم کاتەدا حسن بەئارامیەکەوە بەرەو محمود رۆیشت و وتی محمود پارەکەم بدەرەوە. محمود بەگریانەوە وتی: پارەی چی؟

وەڵامی دایەوە ئەوپارەیەی بەبێڕەحمی لێت دزیوم تۆ لەهەمووکەس باشتر ئەزانی لەکوێم دادەنا.

محمود وەکو شێت وتی: من پارەی تۆم نەبردووە وازم لێبهێنە ئیتر لەم زیندانە زیاتر بۆکوێ برۆم نازانم چۆن پێت بسەلمێنم ئاگام لەپارەی تۆ نیە؟

لەم کەین و بەینەدا هەموان لەخەو راپەڕین و چواردەوری محمود و حسن یان دا عەباسی کاتێک بینی محمودی بێچارە وەختە لەداخدا دەمرێت خێرا و بەپەلە پارەکەی دایەوە بە حسن و وتی: باوەڕم نەدەکرد بەوئەندازەیە کەر و نەفام بیت و شۆخی هەڵناگری بەڕاستی دونیا گۆڕاوە.

حسن کاتێک پارەکەی بەدەست عەباسەوە بینی چەند کاتێک بێدەنگ و مات بوو سەیرێکی دەوروپشتی کرد و بەخۆشحاڵیەوە پارەکانی وەرگرتەوەو پێکەنینێکی گەورەی کرد کاتێک کوڕو کاڵەکە بڵاودیان لێکرد حسن بەرەو عەباس گەڕایەوە تاپێی بڵێت بۆچی کاری وات

کردووە بۆچی شۆخی وادەکات لەپڕ چاوە پڕ لەفرمێسکەکانی محمود لەشوێنی خۆیدا وشکی کرد و سەری شۆڕکردەوە و وتی: وام ئەزانی تۆ پارەکانی منت بردووە ئاخر تۆ لەنزیك منەوە ئەخەویت.

پاشان دەستی کرد بەگێرفانیدا و پێنج تومەنی دایە محمود، محمود بەدەنگێکی بەرز دەگریا و بەئارامیەکەوە وتی: پارە بەلای منەوە هیچ بایەخێکی نیە، ئیتر هیچ شتێك نیە دڵنەوایی من بداتەوە بەپەلە رۆیشتە سوچێکی تری زیندانەکەوە.

ئەو دیمەنە زۆر ناڕەحەتی کردم بەتوڕەییەوە وتم حسن وام نەدەزانی پارە ئەوەندە بەلاتەوە بەنرخ بێت، بەڕاستی زۆر بێ رەحمیت هەرگیز وام نەدەزانی بۆ بیست و پێنج تمەن ئەوەندە ئازاری ئەوکوڕە بدەیت.

لەکاتێکدا حسنیش خۆی زۆرناڕەحەت بوو لەوەلامدا وتی: بێژەن راستەکەی من بێڕەحمم بەلام بیشزانە بێتاوانم خۆزگە دەتزانی ئەوپارە چەندە بەنرخە بۆم، ئەگەر راستیەکەت بزانیایە هیچ کات ئەوقسانەت پێ نەدەگوتم. بێژەن هەرلەبەر ئەو پارەیەبوو خرامە زیندانەوە بوارم پێبدە بابۆت باس بکەم بۆئەوەی بزانیت ئەوەندەش گوناه کار نیم. سالێك لەمەوپێش لەماڵێکی سەرمایەداردا نۆکەربووم و مانگی سێ تمەن پارەم وەردەگرت و دەمدا بەدایکە پیرەکەم بۆئەوەی پێی بژی دایکە پیرەکەم بەهۆی گریانی زۆرەوە بۆ خوشك و برا لەکیس چوەکانم چاوەکانی ئاوی سپی لێهات خەریك دەبوو کوێر ببێت، رۆژێکیان بردم بۆ نەخۆشخانەیەکی خۆرایی کاتێك پزیشك چاوەکانی دایکمی پشکنی وتی: چارەسەری چاوەکانت دەکەم بەلام پێویستە بیست وپێنجتمەن پارەی نەخۆشخانەکە بدەیت لەبەرئەوەی دایکیشم ئەوپارەی نەبوو بەدڵشکاویەوە لەنەخۆشخانە هاتە دەرەوە.

من دایکم زۆر خۆش ئەویست لەبەر ئەوەی بەڕەنج و پەڕۆ و پاتاڵ شۆردنەوە گەورەی کردم، ئێستا بەئەرکی سەرشانمی دەزانم بەهەرشێوازێك بووە چاوەکانی لەکوێر بوون رزگار بکەم، لەوڕۆژە بەدواوە مانگانەکەی خۆم مانگی سێ تمەن زیاتر نەبوو لای ئەوپیاوەی کەلەماڵی کارم دەکرد دامنا، نەمهێنایەوە تا بیست و پێنج تمەنم پاشەکەوت کرد، لەم کاتەدا خاوەن ماڵەکە نۆکەرێکی تازەی هێنا و مانگی پانزە تمەنیپێدەدا و منی لەماڵەکەی دەرکرد کاتێك بارودۆخەکەم بەوشێوەیە بینی وتم: دەی پارەکەم بدەرێ بالێرەدا بڕۆم.

خاوەن ماڵەکە بەتوڕەییەوە وتی: پارەت لەلای من نیە دەی خێراکە لێرە بڕۆ، منیش وتم ئاخر بیست و پێنج تمەنی منت لەلایە هەتا نەمدەیتەوەلێرە ناڕۆم، خاوەن ماڵەکەش پەلی گرتم و کردمیە دەرەوە و وتی: بڕۆ دەرەوە کەری نەفام پارەی چیت دەوێت لێم؟

هەرچی هەوڵمدا نەمتوانی پارەکەی لێ بسەنم بەناچاری وتم: دەبهێڵە با جلەکانم هەڵبگرم و بڕۆم، کاتێك ویستم جلوبەرگەکانم هەڵبگرم، بیست و پێنج تمەنم لەمێزەکەی ئەودا هەڵگرت و خێرا چومە دەرەوە واتە ئەو برە پارەیەی کە مافی خۆم بوو، بۆ عەسری هەمان رۆژ خاوەن ماڵەکەم لەکەلانتەری شکاتم لێدەکات، لەلای دایکم دانیشتبووم و دڵنەوایم دەدایەوە، دەموت پێی بەیانی دەتبەم بۆلای دکتۆر و چاوەکانت چاك دەبێتەوە لەناکاو پۆلیسێك لەگەڵ کوڕێکی خاوەن ماڵەکە خۆیان کرد بەژوردا، کاتێك کوڕی خاوەن ماڵەکە منی بینی خێرا روی کردە پۆلیسەکە و وتی: ئەم کوڕەیە دزی لێکردوین پۆلیسەکەش خێرا دەستگیری کردم و وتی: هەستە بابڕۆین بۆ کەلانتەری چونکە

تۆدزیت ئەبێت لەگەڵم بێیت، لەم کاتەدا دایکم بەگریانەوە وتی: توخوا کوڕەکەم مەبەن هیچ گوناهێکی نیە،

پاڕانەوەکانی دایکم هیچ سودی نەبوو بردمیان بۆ کەلانتەری، خاوەن ماڵەکەم وەکو خاوەن حەقێك وتی: ئەم کوڕەدزە تائێستا لەماڵەکەمدا چەندین جار دزی کردووە ئێستاش بۆیە هێناومە بۆئێرە بۆئەوەی پەند وەربگرێت. پاشان شەش مانگ زیندانیان بۆبڕیمەوە ئێستاش ئەم پارانەم هەڵگرتوە بۆئەوەوی کاتێك لەزیندان گەڕامەوە چاوەکانی دایکمی پێ چارەسەر بکەم.

پاش ئەم قسانە بەجێی هێشتم چوە گۆشەیەکی زیندانەکە وە کاتێك ئەو ڕۆیشت خێرا چووم بۆلای عەباس بۆئەوەی پێی بڵێم ئیتر شۆخی وانەکات لەوکاتەدا عەباس سەرگەرمی قومارکردن بوو منیش هیچم پێنەوت.

لەپاش ئەوشەوە، ئیتر محمود لەلامانەوە نەخەوت. هەموو شەوێك دوور لەهەمومان دەخەوت و نەدەچوو بۆلای هیچ کەسێك، لەهەموان دوردەکەوتەوە. ڕۆژێکیان نیوەڕۆ سەرنجمدا نانەکەی نەخواردوە و بەلای خواردنەکەیەوە خەوی لێ کەوتوە. بەئارامیەکەوە چومە لای سەریەوە و دەستەکانم بەهێواشی بردە پێشەوە قژەکەی ناوچەوانیم بەهێواشی هەڵدایە وە چەندجارێك بانگم کرد محمود، محمود یەکسەر چاوەکانی کردەوە و چەندساتێك تەماشای کردم دوبارە چاوەکانی نوقاندەوە.

لەنیگای محمود دا خەم و پەژارە شەپۆلی دەدا، ئاشکرا نەبوو لەو روخسارە زەرد و لاوازەیدا چ نهێنیەك خۆی حەشارداوە، بەنەرمیەکەوە وتم: محمود هەستە. کارم پێتە بۆچی خۆت لێمان دوردەگریت،

زیندانەدا لەیەکتری زیاتر هیچ کەسێکی ترمان نیە کەواتە پێویستە یەکتریمان زۆرخۆش بوێت تەواوی زیندانیەکان تۆیان خۆش دەوێت تەنانەت حسن یش خۆشی دەوێیت باوەڕبکە زۆر پەشیمانە لەوەی کردی دەرحەقت، تۆ پێویستە لێبوردەبیت و لەهەڵەکەی ببوری.

ئێمە لەم دونیایەدا نەسامانمان هەیە ونەدایك و باوك و سەرپەرشتیارێك تائاگای لێمان بێت بەلایەنی کەمەوە ئەبێت خۆمان لێبوردەبین و ئاگامان لەخۆمان بێت، محمود هەستە چاوەکانت بکەرەوە تۆ وەکو برای من وایت ئێمە لەم دونیایەدا هەمومان برای یەکترین، لێت دەپرسم ئایا چاکتر وانیە لەم دڵە بچوکەدا لەجێی رق و کینە، خۆشەویستی و دڵسۆزی بچێنین و یەکتریمان خۆش بوێت؟ هەستە ئەمەوێت قسەت لەگەڵ بکەم، حەزناکەیت لەگەڵ برای خۆتدا قسە بکەیت؟ من بەبرای‌خۆمت دەزانم پێویستە تۆش بەبرای خۆتم بزانیت لەبەر ئەوەی لەبرای راستەقینە نزیکترین لەیەکەوە چاك وایە لەدەردی یەکتری بزانین.

پاشان محمود بەئارامی هەستا و منیش وتم:بۆچی نانت نەخواردوە؟

وەڵامی دایەوە حەزی لێناکەم.

وتم: هەستە و کەمێك لەنانەکەت بخۆ چونکە زۆر درەنگە باشیش نایەتە بەرچاوم زۆربێتاقەت دەبم ئەوەندە بەغەمباری تۆ دەبینم ئەگەر پێویستت بەپارەیە گرنگ نیە بەلامەوە نزیکەی سەد و پەنجا تمەنم پێیە هەرچەنێکت بوێت پێتی دەدەم ئەگەر هەمویشیت بوێت پێتی دەدەم، حەزدەکەم هۆکاری ئەو غەم و پەژارەیەی تۆ بزانم پێم بڵێ بزانم بۆئەوەندە نارەحەتیت لەوانەیە یارمەتیت بدەم یان هەر هیچ نەبێت

کارێکت بۆئەنجام بدەم، ئەگەر کەمێك لەو گیروگرفتانەی ناو دەرونت بەمن بڵێیت کەمێگ باری شانت سوکتر دەبێت.

تورە بوو وتی توانای قسەکردنم نیە تکات لێ دەکەم هیچم لێمەپرسە برۆ، تەنها جێم بهێڵە پێویستم بەپارە نیە زۆر نارەحەتم هەتا زوە برۆحەزناکەم لەگەڵ کەس قسە بکەم نامەوێت کەس لەبەسەرهاتی من بزانێت.

وەڵامم دایەوە مەحمود وامەزانە هاتوم بۆلات تابەسەرهاتی تۆبزانم نەخێر، مەبەستم خۆهەڵقورتاندن نیە لەکاروباری خەڵکی هاتوم تاتۆزێك ئەحواڵ پرسیت لێ بکەم ئاخر بەبرای خۆمت دەزانم.

بەتورەییەوە وتی: بێژەن ئاخر من هیچ کەسم نیە.

وەڵامم دایەوە منیش هیچ کەسم نیە نەدایك نەباوك، ئۆف درۆدەکەم باوکم هەیە بەڵام ئێستا باوکی من نیە تایبەتە بەباوەژنەکەم ئەو لەنێوان من و ژنەکەیدا یەکێکمانی هەڵبژارد، ئەو خۆی نەیویست باوکی من بکات حەزیدەکرد مێردێکی گوێڕایەڵی ژنەکەی بێت، چۆن تازە بەباوکی بزانم.

لەناکاو محمود دەستەکانی هێنایە پێشەوە و هەردوو دەستمی گوشی و وتی: بێژەن کەواتە باوکت لەماڵ دەری کردوویت؟

وتم: بەڵێ لەماڵ دەری کردووم بەڵام چ کاتێك ئەوکاتەی کوچە و کۆڵانەکان پڕ لەبەفربوون بە پاڵتاوە شڕەکەمەوە و جوتێك پێڵاوی دڕاوەوە لەماڵ دەری کردووم، ئایا ئەم دەردە لەبیردەچێتەوە؟

محمود کاتێك فرمێسك بەچاویدا دەهاتە خوارەوە و وتی بێژەن هەموو دەردەکان فەرامۆش دەکرێن جگە لەدەردی من پاش ئەو رستەیە بێدەنگ بوو.

کاتێك بارودۆخەکەم بەوشێوەیە بینی وتم محمود پێم بڵێ بزانم ناڕەحەتی چیت؟ وەك چۆن من بێ پەردە هەمووشتێکم بۆباس کردی تۆش هیچم لێ مەشارەوە ئاخر ئێمە پێویستە قسە بکەین.

محمود وەك بڵێی ماوەیەکە بەدوای هاوڕێیەکدا بگەڕێت و دەردە دڵی لابکات، یەکسەر وتی: بێژەن من باوکێکم هەبوو ڕۆژانە حەماڵی دەکرد و بەنارامی بژێوی ژیانی پەیدا دەکرد تائەوڕۆژەی بوو بەژێر لۆریەکەوە و مرد، لەپاش مەرگی باوکمان ژیانمان سەخت بوو دایکم ڕۆژانە جل و بەرگی ماڵانی دەشۆری و پارەی پەیدا دەکرد و ئاگای لێمان بوو، چوارمانگ تێپەڕی ڕۆژێك عەسر کاتێك هاتمەوە لەوژێرزەمینەیدا کە ژیانمان دەبردە سەر بینیم دایکم دانیشتوە و دەگری، نزیکە و جەژن بوو هیچمان پێڵاومان بەپێوە نەمابوو ئەوڕۆژە دایکم زۆر بەکوڵ دەگریا کاتێك دایکمم بەوشێوەیە بینی چومە پێشەوە و وتم:

دایکەگیان گەر بتەوێت من ئیتر ناڕۆمەوە بۆ قوتابخانە تا پۆلی شەشیشم خوێندووە ئەڕۆم بۆشوێنێك شاگردی دەکەم ئیتر نامەوێت بڕۆیت شرو شیتاڵی خەڵکی بشۆریت ئەڕۆم کاردەکەم خەرجی خۆمان دەردەهێنم.

دایکم وتی: کوڕم محمود تۆ پێویستە بخوێنیت ئەگینا وەك باوکت ئەبێت حەماڵی بکەیت. بۆمن خەفەت مەخۆ هەرچۆنێك بێت خەرجیتان دەردەهێنم.

شەو بوو یەکێك لەدراوسێکانمان بانگی دایکمی کردوو وتی: وەرە حەوزەکەمان بەتاڵ بکە، دایکم بەپەلە هەستاو ڕۆیشت بۆ خاڵی کردنی حەوزەکە، لەتەواو بوندابوو بەسەردا کەوتە ناو حەوزەکەوە

نیوەگیانێکی تێدابوو دراوسێکانمان هێنایانەوە بۆماڵەوە لەژورە سارددەکەدا پاڵیان خست.

دایکم لەسەرەمەرگدا بوو بەڵام هیچ کەس نەیدەزانی، برا بچکۆلەکەم سەری کردبوە لای سەری دایکمەوە هەموومان برسیمان بوو تەنانەت کرێی حەوزەکەشیان پێنەدابوو. دایکم قسەی لەگەڵ دەکردین بۆئەوەی ناڕەحەت نەبین.

بێژەن هەرگیز ناتوانم روخسارە زەردهەڵگەڕاوەکەی فەرامۆش بکەم، من لەگۆشەیەکدا بەدەنگی بەرز دەگریام. دایکم لەکاتێکدا بەناڕەحەتی قسەی بۆدەکرا وتی: محمود وەرە پێشەوە ئێشم پێتە، رۆیشتم لەتەنیشتیەوە دانیشتم رەنگی زەردهەڵگەڕابوو دەستەسرێکی سپیان بەسەرەوە بەستبوو بۆئەوەی شوێنی برینەکە خوێنی لێنەیەت، بەئارامی دەستی هێنایە پێشەوە و دەستەکانمی گوشی و وتی:

محمود گیان مەگری من زۆرباشم تەنها کەمێك سەرم ئێشێت ئەویش گرنگ نیە ئێمە هەروانابین ئێوە گەورە دەبن و دەچنە سەر کاروباری خۆتان ئەوکاتەش دەوڵەمەند و خۆش بەخت دەبن.

ئەوکاتەدا برابچوکەکەم وتی: دایکە کاتێك گەورەبووم ئۆتۆمبیلێکی زۆرجوانت بۆدەکرم و هەموو رۆژێك پێی دەچین بۆسەیران سەروجوت پێلاویش بۆ عەلی و محمودیش دەکرم. لەوکاتەدا دایکم بەشۆخیەوە وتی: کوڕەکەم سەرو ئۆتۆمبیلیش بۆ علی و محمودیش بکرە.

برابچوکەکەم قسەی دایکمی لێ بووبوو بەڕاست و وتی ئاخر دایکەگیان ئەوان هیچیان پێلاویان نیە ئەبێ پێلاویانبۆبکرم پاشان کەمێك بیری لێکردەوە و دوبارە بەهەمان ئاوازی منداڵی یەوەی وتی

باشە دایکەگیان لەبەرئەوەی تۆ ناڕەحەت نەبی ئوتۆمبیلیش بۆئەوان دەکڕم و یەك بوکەشوشەش لەوانەی هەڵدەپەڕن بۆخۆم ئەکڕم.

لەوکاتەدا دایکم دەستێکی هێنا بەسەریدا و وتی ئەریێ کورە جوانەکەم ئەوکاتانەش من پیرئەبم و ئەبێت ئاگاتان لێم بێت.

براناوگینەکەم ڕۆیشتبوو پارەی خاڵی کردنەوەی حەوزەکە وەربگرێت، بەڵام خاوەن ماڵەکە پارەکەی پێ نەدابوو ووتبوی بڕۆ بەیانی بێرەوە ئێستا وردەمان پێنیە.

لەوکاتەدا براناوگینەکەم بەنائومێدی هاتەوە ماڵ.

دایکم وتی علی گیان پارەکەیان پێدایت؟

وەڵامی دایەوە نەخێر دایەگیان خاوەن ماڵەکە وتی بەیانی پێت ئەدەم. پاشان براکەم لەکاتێکدا لەسەرما هەڵدەچۆقی هاتە پێشەوە و وتی دایکە ئیتر تۆنابێت کاربکەیت لەبەر ئەوەی زۆرناڕەحەتیت ڕۆژانە من دەڕۆم نۆکەری دەکەم و پارە پەیدا دەکەم و ژیانی خۆمانی پێهەڵدەسوڕێنین.

لەوکاتەدا برا بچوکەکەم زۆرناڕەحەت دەکەوتە بەرچاو وتی: دایەگیان علی ڕاست دەکات ئیتر نابێت کاربکەیت تۆ زۆر ناساغیت بهێڵە ئێمە کاربکەین. ئێستا ئەگەر ناهێڵی علی و محمود کاربکەن لەبەر قوتابخانەکەیان بهێڵە من کار بکەم خۆمن هێشتا نەچومەتە قوتابخانەوامەزانە بچوکم و ناتوانم هیچ بکەم دایکە گیان من هەموو کارێك ئەزانم لەبەیانیشەوە دەڕۆم بۆدوکانی ئەکبەر رادەوەستم بۆئەوەی ئەگەر کەسێك شتی کڕی و نەیتوانی بیباتەوە بۆماڵەوە بۆی هەڵدەگرم هەرچی پارەیەکیان پێدام کۆی دەکەمەوەو شەو دەیدەم بەتۆ. بەومەرجەی ئیتر کارنەکەیت ئاخر حاڵت زۆرخراپە.

ئەم قسەو باسانە تانیوەی شەوی خایاند.

نزیکەی بەرەبەیان بوو لەناکاو حاڵی دایکم بەتەواوی خراپ بوو هەردوو براکەم خەوتبوون، دایکم لەخەو هەڵیساندم و وتی کە چۆڕێك ئاوم بدەرێ. جامێکم پڕکرد و دام بەدەستیەوە پاشان زۆربەهێواشی پێی وتم ئازیزم محمود چاوت لەبراکانتەوە بێت مەهێڵە بێ سەرپەرشت بن لەبەرئەوەی جگە لەتۆ کەسی تریان نیە تۆ ئەبێت دایك و باوك و براش بیت بۆیان، کاتێك برابچوکەکەت دەگری پێویستە دڵنەوایی بکەیت، نەهێڵیت پاش من بەشەقامەکاندا گەدایی بکەن، محمود هەرچەند خۆشت هێشتا بچوکیت بەڵام هەردەبێت چاوت لەبراکانتەوە بێت.

لەپاش نیوسەعات دایکم مرد.

بێژەن تۆنازانیت دایکە بەتبەختەکەی من چەند بەسەختی گیانی دەرچوو گریانەکەی من براکانمی خەبەرکردەوە و بەسکی برسی بەسەر تەرمەکەیدا دەگریاین. ئەوڕۆژە لەلایەن شارەوانیەوە بەخاك سپێدرا و منیش بومە سەرپەرشتی دووبراکەم ویستم گەدایی بکەم لەهاوڕێکانم تەریق دەبوومەوە. برابچوکەکەم بەردەوام داوای دایکمی دەکرد هەمووکات دەیگووت دایکم بۆکوێ رۆیشتوە کەی دەگەڕێتەوە؟

براکانم دەگریان و هاواریان دەکرد منیش لەگەڵیان دەگریام نەمدەزانی چی بکەم.

دەمەو ئێوار بوو برابچوکەکەم لەبرسانا ئۆقرەی نەمابوو هیچمان نەبوو پێی بدەم، چرای دیوارەکەمفرۆشت بە دوو پیاڵ و بەناچاری نانم کڕی و دام بەبراکانم.

شەو لەماڵ چومە دەر برابچوکەکەم هاواری کرد محمود خاوەنماڵەکە لێفەکانی فڕێداوەتە دەرەوە گەڕامەوە دواوە براکەم راستی کرد. خاوەن ماڵەکە شڕوشیتاڵەکەی فڕێ دابوە دەرەوە، بەدراوسێکانی دەووت دایکیان دومانگە کرێی نەداوەمەتێ ئێستا بڕۆم پارەکەی لەکێ بسەنم، پاش ئەو هەموونارەحەتیە سێ منداڵی بەسەردا جێهێشتوم خۆناچار نیم هەتیوی خەڵکی بەخێو بکەم. گشت دراوسێیەکان پشتیوانی ئەویان دەکرد و دەیان ووت راست دەکەیت.

کەلاوەیەك لەنزیکمانەوە بوو قەرەوێڵە و لێفە شڕەکانم هەڵگرت و لەکەلاوەکەدا دام نان، دووبراکەمم لەژێر قەرەوێڵەکەدا دانا و وتم ئێوە لێرەدابن تابڕۆم شتێك بهێنم بۆتان و بیخۆین.

هیچ کەس نەبوو یارمەتیمان بدات ئەوشەوەش بەدەستی بەتاڵی گەڕامەوە بۆ کەلاوەکە هەردوو براکەم لەسەر خۆڵەکەدا دانیشتبوون و لێفەکەیان دابوو بەسەریاندا و لەتاو سەرما و برسیەتی دەگریان. رێك وەکو ئەوە وابوو لەم گەردونەدا بەتەنها ئێمە دروست بووین هیچ کەس ئاوڕی لێنەدەداینەوە. کاتێك باروودۆخەکەم بەوشێوەیە بینی بڕیارم دا دزی بکەم. پاشان هاتمە سەرشەقامەکە و چومە دوکانێکی وشکە بار فرۆشیەوە خاوەن دوکانەکە لەدوکان نەبوو شاگردەکەشی خەریکی رێك خستنی شتەکان بوو منیش بەهەلم زانی و چومە لای دەخیلەی پارەکەوە چەند تمەنێکم هەڵگرت و پاشان هەڵهاتم.

بەڵام خاوەن دوکانەکە لەگۆشەیەکی شەقامەکەوە راوەستابوو پێی زانیم و خستمیە ژێر چاودێریەوە و لەکۆڵانێکی داخراودا گرتمی. پاشان بەتوڕەی یەوە وتی هەتیو پێم بڵێ لەدوکانەکەی مندا چیت دەکرد؟ خێرا وەڵامم دایەوە و وتم کاتەگیان مەمدەرە دەست پۆلیسەوە

هەموو ڕاستیەکانت پێدەڵێم، بەتوڕەییەوە وتی بێدەنگبە هەتیو پێم بڵێ لەدوکانەکەمدا چیت دەکرد؟

خێرا وتم کاکەگیان بەمەبەستی دزی کردنەوە چومە دوکانەکەتەوە لەبەر ئەوەی براکانم برسیانە و کەسیشمان نیە چاوی لێمانەوە بێت چومە دوکانەکەتەوە، لەناو دەغیلەکەتدا ئەم چەند تمەنەم دزی تەنها مەبەستیشم ڕزگارکردنی گیانی دوبراکەمە لەبرسیەتی تەنها سێ تمەنم دەرهێناوە.

خاوەن دوکانەکە زۆرناڕەحەت بوو لەقسەکانم وتی ئەگەر ڕاست بکەیت ئازادت دەکەم و بەپۆلیس ناڵێم.

منیش دەستم بردە پێشەوە و نیشانم دا.

ئەو ماوەیەك سەیری سێ تمەنەکەی دەستمی کرد و پاشان بەبۆکس و زللە کەوتە سەرو گوێلاکم و وتی درۆزنی بێ ئابڕو ویستت فێڵم لێ بکەیت پاشان بردمی بۆکەلانتەری لەوێدا زانیم کەنەمزانیوە چەکێکی هەزار تمەنیم هەڵگرتوە چون تائەوکاتەش چەکم بەچاو نەبینی بوو چەکەکەش لەنێوان یەك تمەنیەکاندا بوو پێم نەزانی بوو لەبەر ئەوەی پەلەی ڕاکردنم بوو. هەر لەبەر ئەوهۆیەش یەك ساڵ زیندانیان بۆبڕیمەوە.

ڕوخساری براکانم ئازارم دەدەن نازانم ئێستا لەکوێن چیان لێهاتبێت ئێستا دەبێت لافاوی هەژاری چی لێکردبین هیوام بەژیان نەماوە. بێ نەوایی براکانم ئازارم ئەدەن، بێژەن نازانم زیندوون یان مردوون، برا بچوکەکەم بێگومان ئێستا لەوسەرما سەختەدا ڕەق بۆتەوە ئاخر زۆرمنداڵە تەمەنی پێنج ساڵانە، برا بەتبەختەکانم هێشتا چاوەڕوانی منن حەزدەکەم تەنها بۆجارێك بیانبینم، بێژەن تۆبڵێی زیندوبن؟

کاتێک دەمەوێت نان بخۆم دەکەومەوە یادی براکانم بەبرسیەتی لەسەر گڵەکەدا دانیشتبوون و لێفە کۆنەکەیان بەسەردا نابوو.

محمود فرمێسک بەچاوەکانیدا خوڕەی دەکرد هاواری دەکرد و دەتلایەوە وەکو شێت هاواری دەکرد، قسەی هەڵیت و پڵیتی دەکرد بەردەوام بانگی براکانی دەکرد ئەوەندە ناڵە ناڵەکەی جەرگ بڕ بوو منیشی هێنایە ناڵە ناڵ و کوڕوزانەوە، وەکو شێت هاوارم دەکرد و دەگریام، روخسارە هەڵبڕوزاوەکەی ئەوکوڕە دوانزە ساڵەیە ئەوەندە ئازاری دەدام هەرلەخۆمەوە هاوارم دەکرد و دەمناڵاند قسە ئازاراوی و خەمناکەکانی ئەم کوڕە وەك پەردەیەکی سینەما بەبەرچاومەوە دەهات و دەڕۆی و دڵی دەهێنامە لەرزە.

زیندانەکان هەموویان دەوریان لەمحمود دابوو هەموویان دەگریان چ گریانێك خوێن دەباری ، محمود چاوەکانی نابوو بەیەکدا و تەخت راکشابوو زیندانەکان کەلەچواردەورمان بوو چوارپەلی محمودیان هەڵگرت وبردیانە گۆشەیەکی تر. بێدەنگی هەموو زیندانەکەی گرتەوە هیچ کەس قسەی نەدەکرد هەموویان دەگریان.

سەیری هەرلایەکم دەکرد جگە لەدیوارە بەرزەکەی زیندان هیچی ترم نەدەبینی چیبکەم حەزم دەکرد هاوار بکەم بەڵام جگە لەبێدەنگی هیچ چارەیەکی ترم نەبوو.

چەند رۆژێك بەسەر ئەوباسەدا تێپەڕی و هیچمان محمودمان نەبینیەوە عەباس دەیوت محمود زیندانیەکەی تەواو بووە و ئازاد بووە. بەڵام حسن دەیوت لەبەر ئەوەی محمود نەخۆش بوو ئازادیان کردوە. لەبەر هەرهۆیەك بوو من نەمبینیەوە هەندێ جار ئەحمد دەیووت من

وامدەزانی لەهەموتان بەدبەخترم بەلاَم ئێستا ئەزانم محمودی بێچارە لەگشتمان بەتبەخترە بەلاَم خۆزگەم بەخۆی ئازاد بووە.

رۆژ بەدوای رۆژدا تێدەپەڕی، ئێمە کۆمەڵێك زیندانی بەیەکەوە دوور لەخەڵکی بەردەوام بووین لەژیانی پڕ لە چەرمەسەری ناو زیندان. لەوماوەیەدا هەمیشە لەبیری نێرگس دا بووم ساتێك لەبیرم نەدەچووەوە بالاَ جوان و چاوە شینەکانیم هەرگیز لەبیر نەدەچووەوە.

رۆژێك سەرلەبەیانی پاسەوانێك هاتە زیندانەکەوە بانگیان کردم و وتی‌کچێك داوای تۆ دەکات و وادەزانم خوشکت بێت، بەپەلە خۆم گەیاندە پەنجەرەی زیندانەکە.

نێرگس لەپشتی شیشی زیندانەکەوە بە چەپکێك گوڵی سپیەوە چاوەڕوانی منی دەکرد. کاتێك منی بینی سەری شۆڕ کردەوە و بەهێواشییەکەوە وتی ئەزانم ئەم هەموو ئازار و ناڕەحەتیەی تۆ لەگەردنی من و دایکم دایە. بەپەلە قسەکەیم پێ بڕی و وتم: نەخێر نێرگس تۆ و دایکت هیچ تاوانێکتان نیە چاك وایە باسی رابردووش نەکەیت.

پاش ئەم قسانە دەستی هێنایە پێشەوە و چەپکە گوڵەکەی دابەدەستمەوە. وتم نێرگس ئەم گوڵە چەند لەخۆت دەچێت وەك خۆت بۆنخۆش و جوانە. گوڵەکانیش وەکو مرۆڤ چارەنوسیان هەیە ئەم گوڵە جوان و گەشەش ناچارە تەمەنە کورتەکەی بەدەستی منەوە لەزینداندا بەسەر بەرێت پاشان پەنجا تمەنم لەپارەکە دابەدەستیەوە.

نێرگس لەسەرەتادا بەسەرسوڕمانەوە روانیە پارەکە و پاشان وتی هەمووی بۆمن؟ وەلاَمم دایەوە بەڵێ هەموی بۆ تۆ. بەخۆشحاڵیەوە پارەکەی لێوەرگرتم و وتی ئەم پارەیە زۆربەنرخە بۆمن چون تۆنازانیت

دایکم پاش ئەوەی پارەی سەعاتەکەی خەرج کرد دەستی کرد بە شۆردنی شڕوشیتاڵی خەڵکی بەڵام ڕۆژێکیان لەقەراغ ڕوبارەکەدا قاچی دەخزێ و دەکەوێتە ناو ڕوبارەکەوە تەنانەت تەرمەکەشیمان نەدۆزیەوە لەو ڕۆژە بەدواوە من بوومە سەرپەرشتی خوشك و براکانم ئەمڕۆش هیچ پارەم پێ نەبوو ئەم پەنجا تمەنەت تاماوەیەکی زۆر بەشمان دەکات و لەبرسیەتی ڕزگارمان دەکات پاشان خواحافیزی کرد لەزیندانەکە چوەدەرەوە.

لەو ڕۆژە بەدواوە عەشقی نێرگس بەتەواوی دامەن گیرم بوو لەم جیهانە گەورەیەدا جگە لەو هیچ کەسی ترم نەبوو، ئەو هەموو کەسێکی من بوو زۆر زۆرم خۆش دەویست بەڵام بەباشی نەمدەزوانی ئەویش منی خۆش دەوێت یان نا بەڵام چۆن ئەبێ خۆشی نەوێم ئەویش وەکو من مرۆڤێکی سەرگەردان بوو کەسێکی بێ سەرپەرشت و هەژار و نەدار ئێمە هەردوکمان ئاگامان لەدەردی یەکتر هەبوو لەزمانی یەکترمان دەزانی. بەوشێوەیەی من خۆشم دەویست خۆشەویستی ئەویشم هەست پێدەکرد.

پاش دومانگ دیسانەوە نێرگس هاتەوە بۆلام ئەمجارەیان کارتۆنێکی بچوك شیرینی و چەند چەپکە گوڵێکی بۆ هێنابووم، زۆر خۆشحاڵ دەکەوتە بەرچاوم پێی وتم بێژەن بەوپەنجا تمەنەی پێت دام هەندێك خەڵوزم کڕی پاشان بەهەندێکی تری پارەکە ژورێکم پێ گرت بەکرێ و خوشك و براکانم تێ بردوە، لەبەر ئەوەی لێفەمان نییە ڕۆژانە خەڵوزەکە دادەگیرسێنین و ژورەکەی پێ گەرم دەکرد بۆئەوەی پێویستمان بەلێفە نەبێت. خۆشم لەماڵی دەوڵەمەندێدا ڕەنج بەری دەکەم، بەڵام بەداخەوەم لەماوەی بیست و چوارسەعاتدا یەکجار سەر

لەخوشك و براكانم دەدەم، ئەویش بۆئەوەی خۆراكیان بۆبیەم. تا ئەندازەیەك لە هەژاری و بەتبەختی رزگارمان بووە، پاشان خواحافیزی كرد و رۆیشت.

كارتۆنە شیرینی و چەپكە گوڵەكانم دابەش كرد بەسەر هاوڕێ زیندانیەكانم دا بەڵام كەسیان گوڵەكانیان لێوەرنەگرتم لەبەر ئەوەی لەوزیندانەدا كەسیان سەرنجیان نەدەدایە گوڵ، گوڵەكانم كردە ناوپەرداخەوە و لەگۆشەیەكی زیندانەكەدا دامنا، لەوڕۆژە بەدواوە نێرگس نەگەڕایەوە بۆلام، بەڵام من ڕۆژانە چاوەڕوانی ئەوم دەكرد. ڕۆژانە لەجیاتی قومار كردن و یاری كردن و فێری گیرفان بڕین بون دەرزم دەخوێند بایی سی تمەن لەپارەكانم كتێبم كڕی واتە پێنج تمەنم دابە پاسەوانەكە بۆئەوەی بایی سی تمەن كتێبم بۆبكڕێت ئەو كتێبانەی خۆم مەبەستم بوو، لەجیاتی فێربوونی كرداری خراپەی ناو زیندان سەرگەرمی كتێب خوێندنەوە بووم كەوتبومە ناو كۆمەڵێك گیرفان بڕەوە كەهیچ سڵیان لەكرداری خراپە نەدەكردەوە، تواناو خۆڕاگریەكەی من ئەوپەڕی لەڕادە بەدەر بوو لەگەڵ ئەو هەموو مرۆڤە خراپەدا بتوانم پارێزگاری لەخۆم بكەم، ئەو توانایە دەیتوانی كێو لەبندا هەڵبكەنێت، ماوەی یەكسالْ ڕوبەڕوبونەوە لەگەڵ كرداری ناشیرین و ناپەسەند لەبەرئەوەی ئەو نەخۆشیە خراپە كارم تێ نەكات ئەویش هێز و وزەیەكی پێویستی دەویست. میكرۆبی سیل لەئەنجامی تێكەڵاوی بوون توشی هەموان دەبێت مەگەر كەسێك زۆربەهێز بێت ئەو میكرۆبە كاری تێنەكات ئەو بەدڕەوشتی و خراپەكاریەی ناو زیندان زۆر خراپتر بوو لە میكرۆبی سیل، هێز و توانای لەبنەهاتوی من بوو توانیم سەر بكەوم بەسەر ئەو هەموو بەد ڕەوشتیەدا و بەردەوام بم لەخوێندنم.

ئەوی شوێنی خراپەکاری بوو کۆمەڵێك مرۆڤی بێسەرپەرشت و بەد ئەخلاقی تێکرابوو هەرگیز چاوەڕوان ناکرێت لەوشوێنە پیسەدا مرۆڤی پاك و رەوشت بەرزی لێ بێتە دەرەوە، لەوشوێنە خراپەدا ئەبوایە دز و خراپەکاری بەدڕەوشت دەرچومایە.

کۆمـــەڵگا دەیویـــست بەوشـــێوەیە بەدڕەوشـــتی و خراپـــەکاری رماوبـەرێت: نەیـدەزانی ئەوشـوێنە خـۆی هۆکـاری بەدڕەوشـتی و بەدئەخلاقی یە. ئەو شوێنەی خراپـەکاری لـەمرۆڤ دادەماڵێت زانکۆ و خوێندنگایە، مرۆڤی پـاك و سالم پێشکەش بـە کۆمـەڵگا دەکـات نـەك زیندان، ئەو شوێنە قوتابخانەیە مرۆڤی پاك بەرهـەم دێنێت نەك زینـدان مرۆڤ نوقمی خیانەت و بەدڕەوشتی دەکات. خۆزگە ئەم راستیە گەورەیە کاربەردەستانی کۆمـەڵگا دەیانزانی ئەوکاتـە دەرگـای خۆشبەختی یـەك بەدوای یەك بەڕوی بێ سەرپەرشتان و بێ نەوایاندا دەکرایەوە.

رۆژانە دەرسم دەخوێند لەلایەکی ترەوە نێرگسم لـەبیر نەدەچوەوە رۆژێکیان کاتێك سەرگەرمی خوێندنی ئینگلیزی بووم پاسەوانەکە هاتـە زیندانەکە و وتـی یـەکێك لـە هـاوڕێ زیندانـەکانی ئێـوە زۆر نەخۆشـە و داوای چاوپێکەوتنی بێـژەن و حەسـەن ی کـردووە، بەپەلـە هـەردوکمان بـەدوای پاسـەوانەکەدا رۆیـشتین. لەڕێگـەدا لەپاسـەوانەکەم پرسـی ئەوکەسە نەخۆشە کێ یە داوای ئێمەی کردووە؟ وەڵامی دایەوە محمود.

لـەناکاو بەبیـستنی ئـەم قـسەیە دڵـم داکـەوت زانـیم کـە هـەمان ئـەو محمودە بەتبەختەیە کەوامان دەزانی لەزیندان ئازادبووە، بـەدەم رێگـاوە جولـە و فرمێـسك و ووتـە و روخـسارە زەردهەڵگەڕاوەکـەی محمـودم کەوتـەوە پـێش چـاو کاتێـك گەیـشتینە ژوری پزیـشکەکە پاسـەوانەکە دەرگاکەی کردەوە و من و حسن چوینە ژورەوە دکتۆرەکە هەرکە چاوی

پێمان کەوت وتی: بەداخەوە درەنگ هاتن چون چەند خولەکێك پێش ئەوەی ئێوە بێن محمود تەواوبوو.

بێ ویستی خۆم هەنگاوێك گەڕامەوە دواوە ویستم رابکەم، دەنگی گریانەکەی محمود لەهەموولایەکەوە بەرگوێم دەکەوت ئەودەنگەش تەنها من گوێم لێی بوو لەسەر قەرەوێڵەکەیدا راکشابوو پەردەیەکی سپیان دابوو بەسەریدا دکتۆریش بەبەرگێکی سپیەوە لەگۆشەیەکی ژوورەکەدا راوەستابوو.

روخساری محمود هەرلەبەرچاوم بوو هاوارەکانی ئەم رۆژانەی دوایی بۆ براکانی دەیکرد لەگوێمدا دەزرەنگایەوە هاوارە جەرگ بڕەکانیم گوێ لێبوو بەتەنها من گوێبیستی دەبووم نەمدەزانی چی بکەم حەزم دەکردهاوار بکەم تاگوێم لەهاوارەکانی محمود نەبێت بەڵام هیچ چارەیەکی ترم جگە لەبێدەنگی نەبوو، زۆر بەهێواشی چومە ژورسەری لەنزیکەوە پەیکەرە بێگیانەکەی محمودم تەماشاکرد چاوەکانی نیوە نوقاوبوو وادەردەکەوت هێشتا چاوەڕوانی هاتنی‌براکانیەتی.

ئەو دلۆپە فرمێسکەی لەدوادەقیقەی ژیانیدا لەچاوی هاتبوو نیشانی دەدا لەدواساتی ژیانیدا چ ئازار و ئەشکەنجەیەکی لەم دنیایەدا بینیوە، رەنگی زەرد و دەستەکانی بێ هەست بوون. دەستەکانم بەئارامی بردە پێشەوە و دەستە بێ جوڵە و تەزیوەکانیم گوشی ئەو مردبوو تەنانەت روخساریشی لەمردوی ئاسایی نەدەچوو ئاشکرابوو لەسەرەمەرگیشدا ئازارو ئەشکەنجەی زۆری چەشتوە.

حەسەن هەرلەدەرگاکەدا راوەستابوو بەهێواشی دەگریا و سەری شۆڕکردبوەوە و چاوی بڕیبوە کاشیەکەی ژێر پێی.

لـەم کاتـەدا دووتەقـە درا لەقاپیەکـە و پاشـان دەرگاکـە کرایـەوە هەمووومان سەیری دەرگاکەمان دەکرد دوومنداڵی بچوك یەکێکیان (١٠) ساڵان و ئەوی تریان (٥) ساڵان لەگەڵ پاسەوانێکدا هاتنە ژوورەوە.

پاسەوانەکە بەپەلە وتی ئەم دومنداڵە دەبینن لەبەیانیەوە لەدەرگای زیندانەکەدا راوەستاون و دەپاڕانەوە براکەیان ببینن بەهەر زەحمەتێك بوو هێشتیان بێنە ژورەوە پاشان پێیان راگەیانـدم بیانهێنم بۆئێرە، هەمومان بێدەنگ بوین هیچ کەسێك توانـای قسەکردنی نەبوو، ئـەوان نەیان دەزانی براکەیان مردووە بەئومێدێکی زۆرەوە هـاتون بۆ زینـدان بۆئەوەی چاویان بەبراکەیان بکەوێت.

یەکـسەر کـوڕە گەورەکـەیان دەسـتی کـرد بەگیرفانیـدا و چـەند شیرینیەکی لـەگیرفان دەرهێنا و پەڕە کاغەزێکی چڵکنی ئاڵاندبوو بە شیرینیەکەوە و وتی ئەم شیرینیانە بدەن بەبراکەم.

دکتۆرەکە بەناڕەحەتیەوە روی کـردە منداڵەکە و وتـی کوڕەکـەم ئـەم شیرینیانە هەڵگرە بۆخۆتان ئێمە لێرە شیرینی پێدەدەین.

لەوەڵامدا وتی من ئـەم شـیرینیانەم بەزەحمـەتێکی زۆر پەیـداکردووە، من و برابچوکەکەم پارەی چەندرۆژێك گەدایمان کۆکردوەتەوە و نانمان نـەخواردوە تـا ئـەم شـیرینیەی پـێ بکـڕین ئێـستا ئێـوەش نـاهێڵن شیرینیەکەی پێ بدەم دەی هەر هیچ نەبێ بهێڵن بابیبینم.

دکتۆرەکە وتی براکەتان نەخۆشە ناتوانن بیبینن، لـەناکاو منداڵەکە چەند هـەنگاوێك هاتـە پێشەوە و وتـی ئـەوەی لەسـەر ئـەو قەرەوێڵـەدا خـەوتوە براکـەی منـە؟ بۆچـی نەخۆشـە ئایـا چـاك دەبێتـەوە؟! لـەم دونیایەدا تەنها ئەو سەرپەرشتی ئێمەیە جگە لەو هیچ کەسێکی ترمان نیە و پاشان دەستی بەگریان کرد.

دومندالەکە بەجلە شڕ و پێڵاوە دڕاوەکانیانەوە راوەستابوون مندالە دەسالانەکەیان دەیویست بێتە پێشەوە و براکەی لەنزیکەوە ببینێت بەلام لەدوکتۆرەکە دەترسا هەرچۆنێك بوو چەندهەنگاوێك هاتە پێشەوە و چوە ژور سەری براکەی، هێشتا نەیزانی بوو براکەی مردووە. دلۆپە فرمێسکی سەر گۆنای براکەی پاك کردەوە، پاشان چەندینجار بانگی کرد لەبەر ئەوەی وەلامی نەدایەوە رویکردە دکتۆرەکە و وتی بۆچی وەلام ناداتەوە؟

پاش ئەوەی چەندخولەکێك ژورەکە بێدەنگ بوو دیسانەوە بانگی براکەی کردەوە و دیسانەوە وەلامی نەدرایەوە دیسان هاواری کرد محمود هەستە من عەلیم بۆچی وەلامم نادەیتەوە لەوانەیە حەزنەکەیت قسەمان لەگەلْ بکەیت بەلام خۆ ئێمە هیچ تاوانێکمان نیە پاش رۆیشتنی تۆ ئێمە گشت شوێنێك گەڕاین بەدواتا و نەمان دۆزیتەوە ئێستا یەکجاری تر چاوەکانت بکەرەوە بۆئەوەی بزانم چاکیت یان نە ئەوسا دەڕۆین.

پاشان چەندین جار بانگی کرد، بەلام دیسانەوە وەلامی نەدرایەوە لەم کاتەدا راستیەکەی بۆ رونبویەوە هاوارێکی کرد و خۆی خست بەسەر قەرەوێلەکەی محمودی برای دا و بەگریانەوە دەستی براکەی ماچ دەکرد، برابچوکەکەشی کاتێك ئەمەی بینی هاتە پێشەوە چوەلای برا (١٠) سالانەکەی، دوومندالی بچوك بەرەنگی زەردهەلگەڕاویانەوە لەپالْ تەرمی براگەورەکەیاندا وەك شێت بەکولْ دەگریان ئیتر هەمومان پێکەوە دەستمان کرد بەگریان، پاسەوان دکتۆرەکان دووکەسی زیندانی کە هاوڕێی بووین، تەنانەت دکتۆرێکیان خۆی پیْ ڕانەگیرا و بەپەلە لەژورەکەوە چوەدەرەوە. کوڕە دەسالانەکە هێشتا شیرینیەکەی

بەدەستەوە بوو دەیگوشی و دەگریا بەناڕەحەتیەوە دەیووت من هەشت مانگە دەرگا بەدەرگا بەدوای براکەمدا دەگەڕێم ئەمڕۆ دۆزیمەوە، بەلام چ سودێکی هەبوو براکەم زیندو نیە خۆزگە من بومایە لەجیاتی تۆ براگیان.

من و پاسەوانەکە کاتێک بارودۆخەکەمان بەوشێوەیە بینی محمودمان بەرز کردەوە، کێشی زۆر سوك بوبو غەم و پەژارە و دوری دوو برا برسیی و سەرگەردانەکەی ئێسقانەکانی پوکاندبوەوە، کاتێك بەرزمان کردەوە و خستمانە سەر قەرەوێڵە تایەدارەکە دکتۆرەکە وتی تائێستاش دەردی ئەم کوڕەم نەزانی چی بوو.

وەلامم دایەوە دکتۆرگیان دەردی ئەم کوڕە دەرمانەکەی شتێکی تر بوو دەردەکەی دەردی برا بێ سەرپەرشت و بێ شوێنی وریکانی بوو.

لەوکاتەدا دکتۆر پارچە قوماشێکی سپی دابەسەر جەنازەکەی سحمودا و پاشان لەخەستەخانەکە کەوتینە رێ و دووبرا بچوکەکەی بەشوێنماندا کەوتنە رێ، برا دەساڵانەکەی دەستی خستبوە ناو ناوچەوانی محمودەوە و برا بچوکەکەی قاچەکانی گرت بوو وە دەیلاواندەوە. ئەودیمەنە بەشێوەیەك بوو خەریك بوو بەتەواوی تێکم بدات و بێ ئەوەوی ئاگام لەخۆم بێت بەدەنگی بەرز هاوارم دەکرد، هیچ عێزێك نەبوو بەربەستی فرمێسکەکانم بکات هەموومان نیگەران بووین تا گەیشتینە بەرقاپی زیندانەکە.

تەرمەکەیان لەدەست سەندین و لەگەڵ دومنداڵەکە چونە دەرەوەی زیندانەکە بەئەندازەی دەریایەك غەمبار بووم دووبرابچوکەکەی محمود ؛ەگەڵ برای خۆمدا هیچ جیاوازی نەبوو گەرچی خۆم برام نەبوو بەلام ،،برای خۆمم دەزانین.

ب

کاتێك گەڕامەوە بۆ زیندانەکە سەرنجمدا حسن لەگۆشەیەکدا دانیشتوە و بەدەنگی بەرز دەگری و گشت زیندانەکان دەورەیان دابوو، چومە پێشەوە خێرا عەباس پرسی محمود مردووە؟

وەڵامم دایەوە بەڵێ محمود مردوە.

لەوکاتەدا ئەحمد بەپەلە بەرەو رووم هات و وتی بێژەن حسن راست دەکات محمود مردوە؟

وتم بەڵێ محمود مردوو بۆهەتا هەتایی لەم دونیا پڕ ئەشکەنجەیە رزگاری بوو. یەکسەر ئەحمد بەدەنگی بەرز دەستی کرد بەگریان و زۆر بەزەحمەت دڵنەوایی حسن و ئەحمد م کرد و ئارامم کردنەوە.

ئەوشەوە کاتێك حسن ویستی بخەوێت وتی بێژەن وەرە ئەم بیست و پێنج تمەنەم لێوەربگرە ئەم پارانە وەکو خۆرە تەواوی بەدەنم دەخوات ئاخر لەبەر ئەم پارانەبوو دڵی محمودم شکاند و ئازارم دا سەیری هەر گۆشەیەکی ئەم زیندانە دەکەم روخساری محمود لەبەرچاومدا پەیکەر دەکێشێ و دەڵێ من پارەی تۆم نەبردووە لەوانەیە کەسێکی تر پارەکەتی بردبێت بەڵام بەبێ رەحمی مشتێکم دا لەچەناکەی، بێژەن یارمەتیم بدە خەریکە شێت دەبم.

لەناکاو هاواری کرد و وتی بێژەن سەیری ئەوێ بکە پاشان بەدەست ئاماژەی بۆ شوێنێك کرد کە محمود زۆربەی کات لەوێدا دادەنیشت و بیری دەکردەوە، وتی: توخوا سەیرکە محمود لەوێدا دانیشتوە و دەگری تۆنایبینی؟!

لەم کاتەدا زانیم حاڵی حسن باش نیە یەکسەر لەوەڵامدا وتم بێدەنگ بە. ئەویش لەخۆیەوە هاواری کرد و وتی من روخسارە رەنجاوەکەی محمود دەبینم بێژەن وەڵامم بدەرەوە ئایا گوێت لەدەنگیشی نی یە؟ من

دەیبینم بەباشی دەنگی دەبیستم روخساری هەمیشە لەدڵمدایە تۆ نایبینی؟

ئەزانم محمود قینی لێم بوو ئەو رەفتارەی دەرهەقی ئەو کردم هەرگیز لەبیرم ناچێتەوە.

وتم حسن محمود ئاسودەبوو لەبەرئەوەی ژیانی زۆر لەمردن خراپتر بوو دڵی محمودی بێچارە ئەوەندە غەم و پەژارەی تێدابوو جێگای قسە و باسی تێدا نەدەبویەوە نەیدەزانی قینی لەکەس بێت دڵنیابە قینی لێت نەبوو.

پاشان لەوجێگەیەی محمود لێی دەخەوت ئەحمد چوە جێگەکەی و بەدەنگێکی بەرز دەستی بەگریان کرد، وتم ئەحمد بەسە ئیتر مەگری ئەوەی چو، چو. وەڵامی دایەوە ئاخر بێژەن گیان ژیانی ئەو رێك لەژیانی من دەچێت ئەزانم محمود چ رەنجێکی کێشاوە خۆزگە لەجیاتی ئەو من بمردمایە.

وتم ئەحمد مەگەر چیبووە خۆزگە بەمەرگ دەخوازیت پێویستە ئومێدەوار بیت، مرۆڤی بێ ئومێد مردووە نابێت بەوئەندازەیەش بێ ئومێد بیت.

وەڵامی دایەوە وتی بێژەن لەم دونیایە هیچ کەسم نیە کەواتە بەچ ئومێدێکەوە زیندەگی بکەم لەم دونیاگەورەیەدا تەنها خوشکێکم هەبوو کاری دەکرد و خەرجی خوێندنی منی دەدا، ئەویش شەوێکیان پیاوێکی سەرسەری کوشتی تەنها لەبەر ئەوەی خوشکەکەم بەرگری لەناموسی خۆی دەکرد منیش بکوژەکەیم بەم دەستانەی خۆم خنکاند و رەوانەی دۆزەخم کرد.

وتم ئەحمد چارەنوسی هەموومان وەکو یەك وایە زۆر نیگەران مەبە.

ئەو شەوە بەهەموو ناڕەحەتیەکانیەوە تێپەڕی و ڕۆژی دوایی بەتەواوی لەبیرمان چویەوە لەبەر ئەوەی خۆشمان لەم دونیایەدا هەڵگری توێشوی غەم و پەژارەی زۆر بووین.

پاش مانگێك حسن لەزیندان ئازاد کرا ناتوانم خۆشحاڵی ئاخر شەوی حسن باس بکەم، وایدەزانی دونیایان پێبەخشیوە تابەیانی خەوی لێنەدەکەوت هەر دەیگوت کاتێك لەزیندان ئازادکرام خێرا دایکم دەبەم بۆ نەخۆشخانە بۆئەوەی چاوەکانی چاك ببێتەوە، کە ڕۆژ بویەوە ویستی لە زیندان بڕواتە دەرەوە وتی بێژەن هیچ کات فەرامۆشت ناکەم لەبەرئەوەی لەم ماوەیەدا هاوڕێیەکی دڵسۆزی من بویت.

منیش بیست تمەنم لەپارەکانی خۆمم دایە ئەویش بەخۆشحاڵیەوە لێی وەرگرتم پاشان خواحافیزی کردو لەزیندان چوەدەرەوە، پاش ڕۆیشتنی حسن تائەندازەیەك تەنها کەوتم لەلایەکی تریشەوە بۆتەنها ساتێك نێرگسم لەبیر نەدەچوەوە تا ئەوڕۆژەی پاش چەند مانگێك هاتە دیدارم کاتێك پاسەوانەکە بانگی کردم وتی وەرە کچێك هاتوە بۆ دیدارت، نەمزانی بەچ شێوازێك خۆمم گەیاندە پەنجەرەی زیندانەکە کاتێك لەپشتی پەنجەرەکەوە ڕاوەستام بەسەرسامیەکەوە تەماشام کرد نێرگس بەدەستەکانی روخساری خۆی داپۆشیوە.

لەکاتێکدا بەبینینی نێرگس زۆر خۆشحاڵ بووم وتم نێرگس هەرگیس بیرم نەدەکردەوە ئەوەندە زوو بێتە دیدارم، ئایا دەزانی من لەم دونیایەدا جگە لەتۆ هیچ کەسی ترم نیە؟ سزام مەدە بەوشێوەیە ڕەفتارم لەگەڵ مەکە.

کە گوێی لەو قسەیەبوو دەستەکانی بەهێواشی بەدەموچاویەوە لابرد پاشان سەرنجمدا دەگری بەپەلە وتم نێرگس ئەوە دەگری چی بوە؟

کاتێـک بەباشـی سـەرنجی روخسـاریمدا بینـیم لـەوماوە یـەدا پیرەڵگەڕاوە ئەوەنـدە لاواز بووبوو بەباشی نەمدەناسیەوە دیسانەوە پرسیم وتم نێرگس پێم بڵێ چی رویداوە؟

بەناڕەحەتیـەوە وتـی بێـژەن حەزناکـەم بەسەرگوزەشـتی خـۆم تـۆ ناڕەحەت بکەم.

وتم نێرگس هیچم لێمەشارەوە هەرچیەك رویداوە پێم بڵێ.

لەوکاتەدا دەستی بەگریانی کرد و وتی ئەو پەنجا تمەنەی پێتدام تا ئەندازەیەك زیندەگیمان هەڵسوڕاند هەندێکم لیدا بە خەڵوز و ژورێکیشم لەخواروی شارەوە پێگرت لێی، خوشك و براکانم بردە ناوی و خۆشم لەماڵە دەوڵەمەندێکدا رەنج بـەریم دەکرد لـە بیست و چوار سـەعات یـەکجار سـەرم لێـدەدان لەبـەر ئـەوەی لێفـەمان نـەبوو خـەڵوزم بـۆ دادەگیرساندن بۆئەوەی گەرمیان بیێتەوە.

رۆژێکیان یەکێك لەدراوسێکانمان هاتە ئەوماڵەی کارم تێدا دەکرد وتی دوێنێ شە و خوشك و براکانت بەهۆی گازی خەڵوزەوە خنکاون. بەپەلە خۆمم گەیاندە ئەوێ نائومێد و بەتبەختانە لەلای تەرمەکانیانەوە راوەستام، نازانیت چەند بەناڕەحەتی گیانیان دەرچوە. یەکێك لەبراکانم ئەوەنـدە بەتونـد سـەری کێشابوو بەدیوارەکـەدا خـوێنێکی زۆری لـێ رژابوە نـاو ژورەکـە کاتێـك کـە بەوشێوەیە بینیمن توانـای قسەکردنم نـەمابوو وەکـو پەیکـەرێکی مۆمیـاکراو سـەیری تەرمـەکانیانم دەکـرد. ئەوان ئەبوایە ئەوشەوە ئەبرساندا بمردنایە بەڵام تۆ هەموومانت لەمردنی سەد لە سەد رزگار کرد، ئەمجارەیان کەسێك نەبوو لەمەرگ رزگاریان بکات. ئێستامن ئەوانم لەدەست چوە و تـەنها کـەوتوم. تـەنهاو بێکەس

نەسەرپەرشت و نە دایك و نەبرا و نەخوشك هیچ كەسم نەماوە پاشان خواحافیزی كرد و رۆیشت.

توانای ئەوەم نەمابوو پێی بڵێم بیرەوە سەردانم لەشم ساردووسڕ بوبویەوە قاچەكانم لە جوڵە كەوتبوو، راستی ژیانی هەموو مرۆڤایەتی هەر ئەوەیە ئایا جۆرێكی تر ژیان نیە، چەندبێ رەحمە زەمانە بەم تەمەنە كەمەوە لەخەم و پەژارەدا سوتاندمی، بیركردنەوە لە تەرمی چەند منداڵی بێ تاوان و بێ سەرپەرشت كەبەهۆی هەژاری و بێچارەیی خنكابن ئەم دیمەنە ترسناكە تەواو مێشكمی تێكدا و توانای خۆڕاگریم لەدەستدا.

كاتێك لەخەوداده‌بووم هەستم بەهیچ نەدەكرد بەڵام لەخەو هەڵدەستام خەفەتێكی زۆرم دەخوارد ئەتوانم زیندەگی دابەش بكەم بەسێ قۆناغ. بە خەبەری خەو مەرگ. خەو نمونەیەكی مەرگ و خەبەریە كە ئێمە كەوتوینەتە نێوانیەوە، كاتێك لەوداین هەست بەهیچ ناكەین تەنانەت ئەگەر كەسێك بەسەرماندا بپەڕێتەوە سەرنج نادەین، ئەگەر ئەو خەوە پلەیەكی تر توندتر بوایە مەرگ دەبوو كەواتە فەرامۆشی لەمەرگ كەوتوەتە پێش خەوەوە، ئارەزوم بوو ئەو خەم و پەژارەیەی تەواوی لەشمی داگیر كردبوو لەبیری خۆمی بەرمەوە بۆئەوەی هەست بەهیچ نەكەم بەڵام دیسانەوە ئومێد زۆری لێدەكردمەوە بۆ ژیان ئەوژیانەی پڕ لە ئازار و ئەشكەنجە بوو.

پاش ئەو رۆژە حاڵم زۆر خراپ بوو، ژورەكەی منیان لە هەموو نەخۆشەكان جیاكردەوە پاش هەفتەیەك دكتۆرێك بۆ فەحس كردنم هاتە ژورەكەم پاش فەحس كردنم، روی كردە پەرستارەكان و وتی ئەو دەرمانەی بتوانێت ئەم كوڕە چارەسەر بكات تەواو بوە و نرخەكەشی

پەنجا تمەنە، من دڵنیام سەرۆکی نەخۆشخانەش ئەو برە پارەیە تەرخان ناکات تکاتـان لێدەکـەم هەرچـۆنێك بـوە ئـەو بـرە پارەیـە لەسـەرۆکی نەخۆشخانە بسەنن.

پەرسـتارەکان وتیـان مـەگر خـۆت ئـەخلاقی سـەرۆك نەخۆشـخانە نەناسیت ئەو هەرگیز ئەو برە پارەیە سەرف ناکات پاشان هەموویان لەژورەکە چونەدەروە.

لـەپاش ئـەو رۆژە بـەدواوە دکتـۆر نەهاتـە سـەردانم پەرستاریش زۆر بەکەمی سەری لێدەدام کاتێك پرسیم لێی بۆچی دکتۆر نایەت بۆ ئێرە؟

وەڵامی دامەوە لەبەر ئەوەی سەرۆکی نەخۆشخانە ئەو برە پارەیەی سەرف نەکرد.

لەو رۆژە بەدواوە شەش مانگی تەواو لەوژورە زەمین گیربووم هیچ ئومێدی چاك بونـەوەم نـەبوو وام هەستەکرد دواین رۆژی ژیانم دەبەمە سەر تەنهایی لەو ژورەدا لەهەموو شتێك زیاتر ئازاری دەدام رۆژێکیان سـەرنجمدا پەنجەرەیـەکی بـچوك لەژورەکەمدایـە لـەماوەی ئـەو شـەش مانگەدا ئەوەندە پەرێشان بووم نەمزانی بوو بەو پەنجەرەیە.

بە زەحمـەتێکی زۆر لەسـەر قەرەوێڵەکـە هەستامەوە سـەر پێـو خـۆم گەیانـدە پەنجەرەکـە، سـەیری دەرەوەم دەکـرد لـەناکاو لەخۆشـحاڵیدا ویـستم هـاوار بکـەم لەبـەر ئـەوەی لـەوێوە دەرەوەی زینـدان بـەجوانی دیاربوو، پاش ماوەیەکی زۆر توانیم دەرەوەی زیندان ببینم.

خـەڵکی لەسـەر خۆ بەسـەر شـەقامەکاندا دەهـاتن و دەچـون هەنـدێك جاریش بەبەر دەرگای زندانەکەدا تێدەپەڕین بێ ئەوەی ئاوڕێك بدەنەوە لـە دەرگـای زینـدان و بـزانن چ ئینـسان گـەلێکی بێـچارە لـەناو ئەوزیندانەدا ژیان بەسەر دەبەن.

لەو بەر شەقامەکەوە دوکانێکی گوڵ فرۆشی لیٚ بوو لق و پۆپی گوڵەکان لەهەمولایەکەوە دەبینران گوڵە جوانەکان لە لقەکانیەوە دیاربوون و لەو شوێنە بچوکەدا زیندانیان کردبوون. لەبەر دەرگای دوکانەکەدا گوڵی لالەی سوری جوان دەبینران لەنێوانیاندا گوڵە مێخەکی شین و سپی بەدەردەکەوتن لەلایەکی تری دوکانەکەوە سەبەتەی پڕلەگوڵی جوانم دەبینی.

ئۆتۆمبیلەکان بەناوەڕاستی شەقامەکەدا لەجوڵەدابوون، لە پیادە رەوەکەدا چەند سندوقێك میوەی گەورە و بچوکی لیٚ بوو خاوەنەکانیان سەرگەرمی فرۆشتنی میوەکان بوون. دەنگی ئۆتۆمبیلەکان لەدەرەوە بەردەوام دەبیسترا.

هەندیٚ جار ئۆتۆمبیلەکان رادەوەستان بۆئەوەی خەڵکی بپەڕێنەوە ئەوەندە ئۆتۆمبیل زۆربوون ئەگەر پۆلیسی هاتوچۆ نەبوایە لەوانەیە لەخولەکێکدا چەند کەسێك بوبنایە بە قوربانی لەم نێوەندەشدا تەنها پیادەڕۆوەکان ئاگایان لەخۆیان بوو ئەگینا شۆفێری ئۆتۆمبیلەکان بایەخیان بەکەس نەدەدا،

کاتێك سەیری میوەفرۆشەکانم دەکرد لەناکاو دومنداڵم بینی بەجل و بەرگی کۆنە و چڵکنەوە لەگۆشەیەکی شەقامەکەدا راوەستابوون وەك ئاشنا دەکەوتە پێش چاوم، کاتێك بەباشی سەرنجی روخساریانمدا ناسیمنەوە براکانی محمود بوون، هەردوکیان گەداییان دەکرد برا دەساڵانەکەی دەکەوتە شوێن خەڵکی و دەستی پان دەکردەوە و دەپاڕایەوە تا پارەی پێبدەن، هەندێکیان لەبەر خاتری خوا دەستیان دەکرد بەگیرفانیاندا و شتێکیان دەدایە و هەندێکیشیان بەقسەی ناشیرین لەخۆیانیان دوور دەخستەوە.

بەلام برابچوکەکەی لەقەراغ شەقامەکەدا سەرگەرمی گەڕان بوو ئاشکرانەبوو لێم بۆچی دەگەڕێ.

لەوکاتەدا یەکێك لەمیوە فرۆشەکان سەبەتەکەی خۆی کرد بەسەریدا بۆئەوەی بیبات بۆشوێنێکی تر، سەرنجمدا سێوێکی لێکەوتە خوارەوە. منداڵە بچوکەکە هەرکە ئەمەی بینی خێرا خۆی گەیاندە سێوەکە و هەڵی گرت خاوەنی سێوەکەش بەمەی زانی و سەبەتەکەی لەسەری داگرت، لەقەراغ شەقامەکەدا داینا، بەرەو منداڵەکە رایکرد. کاتێك لێی نزیك بویەوە دەستی درێژکرد بۆ وەرگرتنەوەی سێوەکە. بەلام منداڵەکە سێوەکەی پێنەدایەوە. هەرچەندە خاوەن سێوەکە هەوڵیدا لێی بسەنێتەوە نەیتوانی، بۆیە خاوەن سێوەکە بەمشت بەربوە منداڵەکە ئەوەندە بەمشت و زلە دایبە سەرو گوێیدا ئەو بێچارەیەی خستە بەزەویدا، ژمارەیەك خەڵك دەوریان لێدان کاتێك خەڵکی دەیانووت بۆوادەکەیت لەو منداڵە بۆ لێی دەدەیت؟ بەدەنگێکی بەرز هاواری کرد:

دڵتان بۆ ئەم هەتیوە نەسوتێت ئەمە دزە میوەکانی منی دزیوە. بەلام براگەورەکەی لەگۆشەیەکدا راوەستابوو لەترساندا دەلەرزی بەگریانەوە دەیگوت بەخوا ئەوپیاوە درۆدەکات ئێمە نازانین دزی بکەین پاشان بەرەو برابچوکەکەی رۆیشت و بەرزی کردەوە و لەگۆشەیەکدا پێکەوە دانیشتن، ئەوانەی دەورەیان لێدابون پشتیوانی خاوەن سێوەکەیان دەکرد، یەکێك لەوخەڵکانە هاواری دەکرد پێویستە پۆلیس ئاگادار بکەینەوە ئەم دومنداڵە بەڕوخساریاندا دیارە دزن لەئێستەوە کەهێشتا منداڵن دزی بکەن سبەینێ گەورەش بن، پیاویش دەکوژن.

پیرە پیاوێك لەسەرەتای روداوەکەوە لەویادابوو وتی ئەم دوومنداڵە دز نین ئەمانە ماوەیەکە لێرەدا گەدایی دەکەن، ئەم منداڵە بچوکە

مەبەستی دزی کردن نیە ئەو هەر نازانێت دزی چیە و حەزی لەمیوە کردەوە و ئەمیش بەبێبەزەییانە بەربوەتە سەرو گوێلاکی.

لەوکاتەدا پیرە پیاوەکە پشتیوانی لەمنداڵەکە دەکرد یەکێکی تر لە خەڵکەکە هاواری کرد و وتی پشتیوانی لەدز مەکە هەر ئەم منداڵە لەوانەیە سبەینێ بەسەر دیوارەکەی تۆدا سەربکەوێت و دزیت لێبکات.

لەکۆتایدا پۆلیسێك هات و کۆمەڵەکەی پەرتەوازەکرد.

دوو منداڵەکە بەناڕەحەتیەوە لەقەراغ شەقامەکەوە دانیشتبوون براگەورەکەی پارەکانی ناو مشتی دەژمارد، زۆر بچوك بوون ئەو خەڵکەیان نەدەناسی.

رۆژێك کەهاتونەتە دونیاوە هەموو کەسێکیان هەبوو. باوك، دایك، لە هەمووی گرنگتر برایەکی گەورە دەیتوانی پەناگایەکی گەورە بێت بۆیان بەڵام ئێستا ئەودوانە هیچ کەسێکیان نی یە. نە دەستێکی نەوازش بەسەریاندا دێت نەدڵێکیش بۆیان دەسوتێت، تەنها و سەرگەردان لەم کۆڵان بۆ ئەو کۆڵان دێن و دەڕۆن هەمیشە دەستیان لەم و لەو پان دەکەنەوە بۆئەوەی پارەیەکیان بدەنێو پێی بژین.

ئەوان بێ کەسن، بێ سەرپەرشتن، شەوانە بەردی سەرشەقامەکە سەرینیانە بێ شوێن و رێن. کاتێك دەگرین کەسێك نیە فرمێسکەکانی سەرگۆنایان پاك بکاتەوە بێتاوان بەر شەق و زللە دەدرێن، لەڕاستیدا چارەنوس چ جۆرە یاریەك دەکات!

پاش بینینی ئەو دیمەنە ئیتر نەچومەوە بەر پەنجەرەکە.

هەر هەمان رۆژ نێرگس هاتەوە دیدەنم نزیکەی مانگێك دەبو نەهاتبوە سەردانم بەڵام لەبەر ئەوەی حاڵ و ئەحواڵیم دەزانی هیچم

پێنەوت. کاتێك نێرگس منی بەوشێوەیە بینی زۆر ناڕەحەت بوو کاتێك ویستی بڕوات چەن دانە شیرینی بۆهێنام پاشان ڕۆیی.

لەوڕۆژە بەدواوە ئەوەندە حاڵم خراپ بوو پەرستاریش نەیدەوێرا بێتە ژورەکەم لەبەر ئەوەی ئەوەك نەخۆشیەکەی منی پێی بگات.

لەتەواوبوندا بووم یەکساڵەکەم تەواو بوو، بەڵام بێهۆش و بێحاڵ لەژوری نەخۆشخانەکەدا کەوتبووم بیرم هەر لە ئازاد بوون نەدەکردەوە، پەرستار حەزی نەدەکرد بمبینێت حەزی دەکرد زوتر بمرم ورزگاری بێت بەدەستمەوە، ئەو بارودۆخەم لەسەیرکردنیدا بەباشی هەست پێدەکرد.

پاش مانگێك لەناکاو پەرستارەکە خۆیکرد بەژورەکەدا و وتی: بێژەن هەستە هەرچیەکت لەزیندانندا هەیە کۆی بکەروە و بڕۆ چونکە زیندانیت تەواو بووە.

وتم ئاخر خۆ من نەخۆشم و ناتوانم لەجێگای خۆمدا هەستم لەم شار و وڵات و دنیایەدا هیچ کەسێکم نیە ئاگای لێم بێت.

پەرستار بەتوڕەییەوە وەڵامی دایەوە چ پەیوەندیەکی بەمنەوە هەیە تۆ بێکەسیت، پێویستە لێرە نەمێنیت هەرچەند لێرە بمێنیتەوە خراپتر دەبیت چونکە خۆت باش دەزانیت نەدەرمان هەیە نە دکتۆر دەی چاکتر وایە لێرە نەمێنیت و بیرێك لەخۆت بکەیتەوە.

پاشان پەرستارێکی ژورەکەی تری بانگ کردوو چونە ژێر باڵم تانزیکی دەرگای زیندانەکە بردمیان لەوێدا وازیان لێهێنام و ڕۆیشتن.

پێنەوت. کاتێك نێرگس منی بەوشێوەیە بینی زۆر نارەحەت بوو کاتێك ویستی بڕوات چەن دانە شیرینی بۆهێنام پاشان ڕۆیی.

لەوڕۆژە بەدواوە ئەوەندە حاڵم خراپ بوو پەرستاریش نەیدەوێرا بێتە ژورەکەم لەبەر ئەوەی نەوەك نەخۆشیەکەی منی پێی بگات.

لەتەواوبوندا بووم یەکساڵەکەم تەواو بوو، بەڵام بێهۆش و بێحاڵ لەژوری نەخۆشخانەکەدا کەوتبووم بیرم هەر لە ئازاد بوون نەدەکردەوە. پەرستار حەزی نەدەکرد بمبینێت حەزی دەکرد زوتر بمرم ورزگاری بێت بەدەستمەوە، ئەو بارودۆخەم لەسەیرکردنیدا بەباشی هەست پێدەکرد.

پاش مانگێك لەناکاو پەرستارەکە خۆیکرد بەژورەکەدا و وتی: بێژەن هەستە هەرچیەکت لەزینداندا هەیە کۆی بکەرەوە و بڕۆ چونکە زیندانیت تەواو بووە.

وتم ئاخر خۆ من نەخۆشم و ناتوانم لەجێگای خۆمدا هەستم لەم شار و وڵات و دنیایەدا هیچ کەسێکم نیە ئاگای لێم بێت.

پەرستار بەتوڕەییەوە وەڵامی دایەوە چ پەیوەندیەکی بەمنەوە هەیە تۆ بێکەسیت، پێویستە لێرە نەمێنیت هەرچەند لێرە بمێنیتەوە خراپتر دەبیت چونکە خۆت باش دەزانیت نەدەرمان هەیە نە دکتۆر دەی چاکتر وایە لێرە نەمێنیت و بیرێك لەخۆت بکەیتەوە.

پاشان پەرستارێکی ژورەکەی تری بانگ کردوو چونە ژێر باڵم تانزیکی دەرگای زیندانەکە بردمیان لەوێدا وازیان لێهێنام و ڕۆیشتن.

## بەندی سیٚ یەم

دوو پاسەوانی دەرگاکە، یەکێکیان لای راست و ئەوی تریان لای چەپ بوو دەرگای زیندانەکەیان کردەوە، بەو نەخۆشیەوە لەزیندان هاتمە دەرەوە پاشان دەرگاکەیان داخست بۆدواین جار سەیرێکی ناو زیندانەکەم کردەوە بەو هەموو خراپییەی ناو زیندانەکە هێشتا حەزم نەدەکرد بڕۆمە دەرەوە چونکە شەوانە بەئاسودەیی تێیدا دەخەوتم بەلاّم ئێستا نەشوێنم هەیە و نەکەسیش دەناسم.

پەناهگایەکیش نەبوو تێیدا رابکشێم گەرچی لەدوورو نزیکەوە تەلاری بەرز و کۆشکی رازاوەی زۆر هەبوون بەلاّم شوێن وریٚ بۆمن نەبوو، هەستم بەغەریبی دەکرد لەنێوان خەلّکی و کۆمەلّگادا خۆمم بەناموٚ دەزانی حەزم دەکرد بگەڕێمەوە بۆ ناو زیندانەکە، لەوێدا لەرۆژگاری درێژدابەناچاری رادەکشام بەلاّم ئەمڕۆ بەئارەزووی خۆم حەزدەکەم بڕۆمەوە بۆ ئەویٚ؛ بەلاّم جێم ناکەنەوە کردمیانە دەرەوە شوێنی من ناکەنەوە کۆمەلّگاش لەمێژەوە دەریان کردووم ئێستا نەلەنێو کۆمەلّگادا و نەلەناو زیندانـدا و نەلەم دونیایەدا شوێن و رێم نەماوە لەگشت لاوە دەرکراوم.

بـەدڵی شـكاو، بەنەخۆشـی و بەچـاوی پـڕ فرمێـسكەوە، بـەڵام بەئومێـدەوە بەقادرمـەكانی زینداننـدا هاتمـە خـوارەوە، شـەقامەكان دوكانەكان، كۆشك و تەلارە بەرزەكان، لەسەرمدا دەخولانەوە سەریان قورس كردبووم، چاوانم رەشكە و پێشكەیان دەكرد، بۆ چەند ساتێك لەوێدا راوەستام دووپاسەوان لـەدەرەوەی زینـدان كـە ئێشككگر بوون ئاگایـان لـێم بـوو بەئیـشاردت ئاگاداریـان كردمـەوە دوور بكەومـەوە. تەنانەت لەپشت دەرگای زیندانیشدا دەریان كردم.

بەئارامی كەوتمە رێ، كوچە و كۆڵان و شەقامەكان وەكو دورگەیـەكی ون بـوو وابـوون نـە ئامـانج دیـاربوو نەشوێن و رێـم، بـەبێ مەبەست بەنەشارەزایی بەكۆڵانەكاندا كەوتمـە رێ بـێ ئەوەی بزانم بۆكوێ دەڕۆم بەباشی نەمدەزانی ئەو رێگایەی پێیدا دەڕۆم كۆتاییەكەی كوێ یە، هەر بەرە و پێش دەڕۆیشتم بێ ئامانج و بێ مەبەست.

نەغـەمبار بـووم نـەخۆش حـاڵ، وەكـو بونـەوەرێكی بـێ گیـان و بـێ هەست بەرێدا دەڕۆیشتم، پێـی پـەتی و روخساره زەردهەڵگەڕاوەكەم و جل و بەرگە شڕەكان بەلای منداڵە بەناز پەروەردەكانەوە لەشێتی دەكرد تاماوەیەكی دوورودرێژ بەردیان تێدەگرتم و هۆ شێتە هۆ شێتە دەكەوتنە شوێنم.

بچوك و گەورە دەیانبینیم، خۆیان لێدور دەخستمەوە لە رێڕەوێكی ترەوە دەڕۆیشتن تەنانەت نەیان دەدا بەلامدا، رێبوارەكانیش كەدەیاندا بەلامدا لەبەر خۆیانەوە دەیان ووت خوایە روخساری چەند ترسناكە لەوانەیە شێت بێت بالێی دوركەوینەوە.

ئەم دیمەنە پیشانی دەدا کەتا چ ئەندازەیەك روخسارم گۆڕاوە، لەم سروشتە گەورە و مرۆڤە زۆرەدا خۆمم ون کردبوو نەمدەزانی کێکم، بۆچی هاتومەتە دونیاوە چ دەکەم ئەبێت چ بکەم.

لەسەر ڕێگەکەمدا دوکانی گوڵ فرۆش و دوکانی قاوەی زۆرم بینی، سەرانسەر شەقامەکان و کۆڵانەکانیش هەر دوکان بوون لەپشت شوشەکانەوە بوکەڵەی گەورە و بچوك جل و بەرگی جوان ئاڵتونی گرانبەها دەستەگوڵی جوان و پاکەتی شیرینی و پێڵاوی جوان جوان ئەبینران بەڵام من بێبەش لە سەیرکردنی هەموو ئەوشتانە تەنانەت ڕێگەم پێنەدەدرا لەپشت شوشەکانیشیەوە سەیریان بکەم، لەبەر ئەوە ئەگەر تۆزێك لەشوێنێکدارابوەستامایە خاوەن دوکانەکان و خەڵکی دەریان دەکردم.

ئەوخەڵکەی بەبێهۆ و بەبێ تاوان منیان لەکۆمەڵگا دەرکرد، دووریان دەگرت لیّم، وایان دەزانی گۆی زەوی تایبەتە بەخۆیان منیان لەگۆی زەوی دورر دەخستەوە لەکاتێکدا منیش خەڵکی ئەم سەر گۆی زەویەم و وەکو خەڵکانی تر دڵم هەیەو هەستم هەیە، بەڵام جیاوازی من لەگەڵ ئەواندا روخسارە زەرد هەڵگەڕاوەکەم و جل و بەرگە شڕەکانم بوو، تەنها جل و بەرگی شڕ و پێی پەتی و ڕەنگی زەردم بوو جیای دەکردمەوە لەو خەڵکە و دوریان دەگرت لیّم، لەکاتێکدا من پێویستم بە دڵسۆزی ئەوان بوو دڵم ئارەزوو مەندی سۆز بوو.

تەنها مۆڵەتی ئەوەم هەبوو بەڕێگەدا بەپەلە بڕۆم بەبەردەم ئەو کەسانەی بەرەو رووم دێن تێپەڕم بۆئەوەی چاویان بەداماویەکەی من نەکەوێت، بەنێوان ئەوخەڵکەدا وەکو سێبەرێکی لەرزۆك دەڕۆیشتم بەڕق و قین و قیزەونیەوە سەیریان دەکردم، لەنێوان ئەو هەموو خەڵکە

پێشکەوتوەدا کەسێك نەبوو ساتێك سەیری روخسارە هەڵبڕوزکاوەکەم بکات، هەمووی رایان دەکرد لێم تەنانەت ئاوڕیشیان نەدەدایەوە لێم.

نزیکەی دەمەو ئێوارە بو لە چۆڵەوانیەکدا پەنام بردە بەر دیوارێك لق و پۆپی درەختەکان شۆڕ بوبونەوە بەسەر دیوارەکەدا بایەکی هێواشی دەهات و لق و پۆپی درەختەکانی بەئارامی رادەوەشاند.

چەند ساتێك تێپەڕی لەناکاو دەستێکی بەهێز پاڵی پێوە نام گەڕامەوە دواوە لەپشت خۆمەوە بونەوەرێکی لەخۆم بەهێزتر و بەتواناترم بینی پاڵیی پێوەنام کەمێك بەرگریم کرد بەڵام شکستم خوارد ناچار بووم بکەومەوە رێ.

ئیتر لەسەر بەردی رەقی شەقامەکانیشدا شوێن و رێم بۆنەمایەوە سەیری هەرشوێنێکم دەکرد خاوەنی هەبوو بەتەنها لەناو ئەو هەموەدا من خاوەنی هیچ شوێنێك نەبووم وەك بڵێی لەسەر ئەم زەویە پان و بەرینەش دا بۆمنیە بژیم لەکاتێکدا لەگەڵ ئەواندا هیچ جیاوازیەکم نەبوو، بەڵکو لەوان زیاتر پێویستم بەسۆز هەبوو وەك بڵێی سەرانسەر گۆی زەویان کڕی بێ وا هەر دەرم دەکەن.

نەمدەزانی چی بکەم هەموو دەرگاکان بەڕومدا داخرابوون بەبێ هۆ لەهەموو شوێنێکدا دەرم دەکەن تەنانەت لەپشت دیوارەکانیشەوە دەریان دەکردم بەکوچەو کۆڵانی زۆردا تێپەڕیم لەو مرۆڤانەی گۆی زەویان بەهی خۆیان دەزانی دووردەکەوتمەوە بۆئەوەی چاویان بە رەنگە زەردهەڵگەڕاوەکەم نەکەوێت.

ئەمجارەیان بەباشی دەمزانی جیاوازی لەنێوان من و ئەواندا هەیە، وەکو جنایەتکارێکی ترسناك لەبن ئەم درەخت و ئەو درەختدا دووردەکەوتنەوە لێم لەمەیانی گەورەی شاردا وەکو پەڵەیەکی رەش لەملا

بۆ ئەولا دەهاتم و دەڕۆیشتم هەمووی رایان دەکرد لێم، منیش لەوان دوور دەکەوتمەوە لەبەر ئەوەی بەباشی دەمزانی نێوان من و کۆمەڵگا مارمیەکی دوور و درێژە.

مەیدانی شار لەنێوان ئەو هەموو جوانیەدا دەدرەوشایەوە منیان بە پەڵەیەکی رەشی سەر نێو چەوانی دەزانی.

بەئارامی چومە ناو مزگەوتێکی گەورەوە ئەوێ ماڵی خوا بوو تەنها خوا خاوەنی بوو، هیچ کەسێك نەیدەتوانی دەرم بکات لەبەر ئەوەی بەگوناهێکی گەورە دەژمێردرا. هەمیشە و هەمووکات دەرگای ماڵی خوا بەڕووی هەموو کەس دا کراوەیە، خوا بەندەکانی خۆی بەباشی دەناسێ.

بەبێترس لەکونجێکدا دانیشتم هاتوچۆی ئەو مرۆڤانەی بەڕوکەش رویان کردبوە خواوە خستە ژێرچاودێریەوە دەمویست بزانم ئەم مرۆڤانەش هەمان ئەو مرۆڤانەن کە چەندساتێك لەمەوبەر دەریان دەکردم. ئێستاش هەموو لەشیان لار کردوەتەوە و لەماڵی خوادا کڕنوش دەبەن، لەکاتێکدا لە گشت کتێبە ئاسمانیەکاندا، مرۆڤەکان بانگهێشت دەکرێن بۆ خۆشەویستی، خزمەت کردن بەخەڵکی بەندایەتی کردنە بۆ خوا.

ئەوانە رێك پێچەوانەی کتێبە ئاسمانیەکان رەفتاریان دەکرد، بچوکترین سۆز و بەزەییان بە بەندە بێ دەسەڵاتەکاندا نەدەهاتەوە کەچی کڕنوشیش بۆ خوا دەبەن.

بەو شێوەیە دانیشتبووم لەناکاو پاسەوانی مزگەوتەکە بەپەلە هاتە پێشەوە بێ ئەوەی قسەیەك بکات دەستی گرتمو دەری کردم. لەبەر ئەوەی وایدەزانی نەخۆشیەکەم دەگات بەکەسانی تر، لەوێشدا دەرکرام.

ئیتر لەو کۆمەڵگایەدا شوێنێك نەمایەوە بۆمن، کاتێك بارودۆخەکەم بەوشێوەیە بینی دەستم کردبە راکردن وەکو شێت بەکوچەو شەقامەکاندا رام دەکرد بۆئەوەی هەرچی زووتر دوور بکەومەوە لەکۆمەڵگا دەبوایە رام بکردایە چون لەکەی نێوچاوانی خەڵکی بووم تا نەوەك کۆسپێك بم لەبەرامبەر خەونە ئاڵتونیە دوور و درێژەکانی ئەوان، من بارێکی قورسی کۆمەڵگا بووم، بوونم وەك داخێکی نەنگی سەر نێوچاوانی کۆمەڵگا بوو، بمەوێت یان نەمەوێت ئەبێت دووربکەومەوە لەبەر ئەوەی بونی من هۆکاری ئازار و ئەشکەنجەی کۆمەڵگا بوو، زۆر زوو لەکۆمەڵگا دوور کەوتمەوە، دوور لەهەموان لەپەنا دیوارێکدا بەدەنگێکی بەرز هاوارم کرد:

بەو شێوەیەی کە ویستتان لەکۆمەڵگا دورکەوتمەوە، ئەو کۆشك و تەلارە رازاوانە ئەو دوکانە پڕ لە خۆراکانە جێدەهێڵم، ئەو کۆڵانە تەنگ و باریکانە کە بەتیشکی گڵۆپی رەنگا و رەنگ وەك ئەڵماس دەدرەوشێتەوە، مەیانی شار بەو پانی و بەرینیەوە کە تایبەتە بەئێوەوە من چاوی تەماعم تێ نەبڕیوە جێی دەهێڵم بەئاسودەیی ژیان ببەنەسەر ئارامیە لەکیس چوەکەتان وەرگرنەوە. من ئەڕۆم بۆئەوەی‌نەوەك جوانی و رازاوەیی شارەکەتان ناشیرین بکەم، خواحافیز رۆیشتم. بەڵێ رۆیشتم، ئەوە ئێوە و کۆشك و تەلارەکانتان ئێوە و خەونە خۆشەکانتان وامن رۆیشتم.

رۆیشتم بۆئەوەی بەئاسودەیی ژیان بەسەر بەرن چون بەباشی هەستی پێدەکەم بونی من لەکۆمەڵگاکەتاندا ئارامیتان لێتێك دەدات بەڵام حەزەکەم بزانم ئەو لەش و لارە لاوازەی من بەو ئەندازەیە ئێوەی بێزار کردووە کەنەتوانن بۆ چەندساتێکیش بێت دڵنەوایم بکەنەوە.

لێرەدا کەسێك نەبوو گوێ لەقسەکانم بگرێت بەتەنها لەبەر خۆمەوە قسەم دەکرد بۆئەوەی کەمێك داخی دڵم هەڵبڕێژم.

لەتەنیشتمەوە کەلاوەیەکی زۆر گەورەی تێدابوو بەپەلە چومە ناویەوە کەلاوەکەش بەحەوشەیەکی نزم دەورە درابوو، حەوشەکەش پڕبوو لە دڕك و داڵ لەناو کەلاوەکەدا گۆزەڵە و قاپ و دەوری شکاو کۆنەی زۆری تێدابوو، دڕکەکانیش هەمووی دەچەقین بە قاچە لاوازەکانم دا.

لەکەلاوەکەدا ژورێکی بچوکی تێدابوو بەپەلە چومە ژورەکەوە وادەردەکەوت کولانەی سەگ بێت، چەند گوێنویەکی شڕو شیتاڵ فڕێ درابوو، بەپەلە چومە ناو گوێنەوەکانەوە، زۆری نەخایان سەیردەکەم دووسەگی گەورە لەبەرام بەرم دا راوەستاون یەکێکیان رەش و ئەوی تریان زەرد نەمدەزانی چی بکەم، لەترساندا گشت گیانم دەلەرزین، هیچ ئامێرێکی بەرگری کردنم پێنەبوو بەرگری لەخۆم بکەم دەستم درێژ کرد بۆئەوەی بەرگری لە لەشە کز و لاوازەکەم بکەم چاوی سەگەکان لە تاریکی شەودا دەدرەوشانەوە ئەمەش زیاتر دەیترساندم.

سەگێکیان چەند هەنگاوێك هاتە پێشەوە و سەرێکی کرد بەژورەکەدا و بەپەلە هاوارێکی بەرزم کرد، بەڵام سەگەکە بەپێچەوانەوە بۆنی کرد بەقاچمەوە، ئەیویست بزانێ ئەم کەسە نامۆیە کێیە ماڵەکەیانی داگیر کردووە بەردەوام سەیری ژورەکەیان دەکرد پاش ماوەیەك چونە دەرەوەلەبەرام بەرمدا پاڵ کەوتن.

بەباشی لێمەوە دیار بوون، کەمێك ترسەکەم رەویەوە چون بۆم رون بویەوە هەرگیز پەلامارم نادەن، ئەوانیش لەبرسانا توانای پەلاماردانیان

نەبو، سەگی بەناز پەروەردە پەلامار ئەدات نەك ئەم سەگە بەدبەختانە شەو و ڕۆژ بەدوای پارویەکدا دەگەڕێن بۆئەوەی لەبرسانا نەمرن.

لەشەوە درەنگانێکدا کوڕێکی بچوك هاتە کەلاوەکەوە قاپێکی گەورەی بەدەستەوە بوو هاتە پێشەوە و قاپەکەی خستە سەر زەوی و ڕۆیشت بەمنشی نەزانی، کەمێك چێشتی ترشاوی لەقاپەکەدا هێنابوو بۆ سەگەکان، ئەوانیش بەپەلە دەستیان کرد بەخواردنی و منیش بەئارامی دەستم درێژ کرد و کەمێك لە چێشتە ترشاوەکەم هێنا لەناکاو یەکێك لە سەگەکان سەیرێکی ڕوورەکەی کرد و منیش لەجێگای خۆمدا وشك بووم.

هەرچۆنێك بوو کەمێك چێشتی ترشاوم خوارد و پاشان خەوم لێکەوت.

سەیرە! ئەوکاتەی خەڵکی بەگشتی لێم دوردەکەوتنەوە و بەچاوی سوکەوە سەیریان دەکردم دوو سەگی برسی پەنام دەدەن و لەمردن ڕزگارم دەکەن دڵسۆز و وەفایی ئەم دوو ئاژەڵە لەڕاستیداجێگای سەرنج و قەدر زانینە.

لەو ڕۆژە بەدواوە ژیانم لەگەڵ ئەو دوسەگەدادەبردە سەر و لەخواردنی بۆگەنی ئەوانم دەخوارد کەم کەم تەندروستیم روی لەباشی بوو.

ڕۆژێکیان تەندروستیم لە هەموو ڕۆژەکانی تر باشتر بوو هاتمە دەرەوە و ڕاستەوخۆ بەرەو گۆڕەپانی شار بەڕێکەوتم لە گۆڕەپانی شار ژمارەیەکی زۆر خەڵکی هاتوچۆیان دەکرد لەنێوان ئەو هەموو خەڵکەدا من کینەیەکی شاراوەم لەدڵدابوو لەبەر ئەوەی دیمەنی ئەو شەوەم لەبیر نەدەچووەوە بەڵام کینەکەشم بەو ئەندازەیە نەبوو ڕقم بێت لێیان من

هەموو مرۆڤێکم خۆش دەوێت ئەگەر چی دوژمنیشم بێ ئەمەش ئەرکێکی مرۆڤایەتی پیرۆزە و پێویستە هەموانیش وابیربکەنەوە.

بەو شێوەیەی لەگۆڕەپانی شاردا سەرقاڵی سەیرکردنی خەڵك بووم لەناکاو سەرنجمدا کەسێك لەپشتمەوەبانگم دەکات بەپەلە گەڕامەوە دواوە یەکسەر لەناو خەڵکەکەدا حەسەنم بینی بەرەو رووم رایکرد و بەرەو پیری رۆیشتم بەتوندی دەستمی گوشی و وتی:

ئۆی بێژەن چەندێ خۆشحاڵم تۆدەبینم کەی ئازاد بووی؟

بەپەلە وەڵامم دایەوە حەسەن گیان منیش بەبینینی تۆ خۆشحاڵ بووم مانگێك لەمەوپێش ئازادبووم.

پاشان دەستمی گرت و کەوتینە رێ، لەرێگەدا پرسیم حەسەن چاوی دایکت چاك بویەوە؟

بەبیستنی پرسیارەکەم ماوەیەك کەوتە فکرەوە و پاشان وەڵامی دامەوە نەخێر چارەسەر نەکرا. لەبەرئەوەوی درەنگ ئازاد کرام بەڵام یەکێ لە پزیشکەکان پێی وتم: .

ئەگەر پێنج سەدتمەنم پێبدەیت چاوی دایکت چاك دەکەمەوە ئێستاش سەرگەرمی پەیداکردنی ئەو برە پارەیەم پاشان پرسی:

بێژەن تۆ لەزینداندافێری چی بویت؟

وەڵامم دایەوە: هەموو کاتەکانی زیندانم هەر خەریکی دەرزخوێندن بووم حەسەن پێکەنینی دەهات بە قسەکەم و وتی:

چۆن ئەی تۆ فێری گیرفانبڕین نەبویت؟ من لەوکاتەوەی لەزیندان ئازاد بووم رۆژانە سەرگەرمی گیرفان بڕینم و شەوانەش دزی دەکەم، بێژەن تۆش وەرە لەگەڵم بە.

وتم: نـا هـەرگیز کـاری واناکـەم، ئامـان لەبـەر ئـەوەی سـەرەنجامی گیرفـان بـڕین و دزی کـردن هـەر زیندانـە، حەسـەن حەزدەکـەم بـزانم ڕەوشتی تۆ بۆچی واگۆڕاوە؟ هەر خـەریکی گیرفان بڕین و دزی کردنی خۆ کاتێك زیندان کرایت لەسەر دزی کردن نەبوو بەڵکو لەسەر پارەکەی خۆت زیندانی کرایت ئەی بۆ ئێستا دزی دەکەیت؟!

وتـی: بێـژەن پێش ئەوەی بکرێمە زیندانەوە زۆر ڕقم لـە دزی کردن بوو بەڵام کاتێك بەخۆڕایی کردمیانە زیندانەوە لەگەڵخۆمدا مەرجم کرد هەر لەزیندان ڕزگارم بێت ئەبێت هەر خـەریکی گیرفان بڕن و دزی کـردن بم ئاخر خۆ بێژەن خۆت باش دەزانی زیندان ڕەوشتی مرۆڤ چۆن خراپ دەکات.

من هەرگیز گیرفان بڕینم نەدەزانی، عەباس چاك فێری گیرفان بڕینـی کردم، ئەویش بەخۆڕایی کەسی فێر نەدەکرد بەڵام لەبەر ئەوەی هاوڕێم بوو پارەی لەمن نەدەسەند. خوا تەمـەن درێژی بکات ئەگەر ئێستا ئەو هونەرەی فێرنەکردمایە ئێستا لەبرسانا دەمردم.

بێـژەن گـەر بزانـی کـە شـەوانە دەگەڕێمـەوە بۆماڵـەوە چەند بـەزەیم بەدایکمـدا دێتـەوە هەرخـەوم لێناکـەوێت دایکە داماوەکـەم چاوی هیچ نابینێت. کاتێك دەگەڕێمەوەماڵەوە و گوێی لەدەنگم دەبێت هاور دەکات حەسەن گەڕایتەوە؟

کـاتێکیش دەچمە تەنیشتیەوە دەس دەکات بەگریان و ئـەڵێت چـی بکەم حەسەن گیان چاوم هیچ نابینێت.

منیش دڵنەوایی دەدەمەوە و پێی دەڵێم دایکە گیان هەرچۆنێك بێت پێـنج سـەد تمەنەکـە پەیـدا دەکـەم و دەیـدەم بەدکتۆرەکـە ئـەویش چـاوەکانت چاك دەکاتـەوە. بێـژەن مـن لـەبیری ئـەوەدام چـۆن ئـەو بڕە

پارەیە پەیدا بکەم ئێستا یارمەتیم بدە باهەرچۆنێک بێت لەوبڕە پارەیە پەیدا بکەم.

لەوەڵامدا وتم بەڵام حەسەن نەبێت ویژدانیش لەبەرچاو بگیرێت. کاتێک ئەم قسەیەی لەمن بیست لەخۆیەوە دەستی کرد بەپێکەنین و وتی:

هەی هەی بێژەن نەمزانی خۆتۆش ئەم قسانە دەزانیت ئێمە چیمان هەیە تا ویژدانیشمان هەبێت کەسێک ئەم قسانە دەکات پارەو سامانی هەبێت لەخۆیەوە لەڕێگای پڕو پوچدا خەرجی نەکات نەک من و تۆ. ئەگەر شوێنی ئەم قسانە بکەوین لەبرسانا ئەمرین.

وتم حەسەن بەدەست خۆم نیە قینم لەدزی کردنە.

ئەویش لەقسەکانم سەرسام بوو وتی:

بەڵام بێژەن تۆ درۆزنی ئەگەر قینت لەدزی بوایە بۆچی لەسەر ئەوتۆمەتە یەک ساڵی ڕەبەق زیندانی کرایت؟

یەکسەر وتم:

_ ئاخر حەسەن زیندان بەتەواوی منی گۆڕیوە و ڕەوشتم گۆڕاوە لەبەر ئەوەشە قینم لەدزی کردنە.

حەسەن لەوەڵامدا وتی:

چ قسەیەک دەکەیت هەتیو من دز نەبووم زیندان فێری دزی کردم چ بگات بەتۆ پێشتریش هەر دزبویت، تەقی دەناسیت! ئەوەی لەگەڵ خۆمان بوو ئەیووت: من بەئەنقەست جنێوم بە پۆلیسێک دا بۆئەوەی بمخەنە زیندانەوە بۆئەوەی فێری هونەری گیرفان بڕین ببم ئێستا تۆش ئەڵێیت زیندان ڕەوشتی گۆڕیم و ئیتر دزی ناکەم.

خێرا وەڵامم دایەوە و: حەسەن بهێڵە با ڕاستیەکانت بۆ ڕوون بکەمەوە من لەبەر خۆم دزیم نەکرد بۆ ڕزگارکردنی کۆشێك هەتیوی برسی دەستم بەدزی کردن کرد لەبەر ئەوەی باش شارەزای دزی کردن نەبووم خێرا دەستگیر کرام.

بەسەرسامیەوە وتی بێژەن ئێستاش لەبەر خاتری من دزی بکە چون دایکە بێچارەکەم خەریکە بەتەواوی کوێر دەبێت، ئەگەر نەتوانم بۆماوەیەکی کەم ئەوبڕە پارەیە پەیدابکەم ئەوا بۆهەمیشە چاوەکانی دایکم نابینێت، تۆ خۆت بخەرە جێگای من ئەگەر دایکت لەحاڵەتی کوێربوندا بێت ئەوکاتە چ بڕیارێك دەدەیت؟

هەرکە وشەی دایکم بیست دڵم کەوتە تەپە تەپ و بەپەلە وتم باشە هاوکاریت دەکەم تەنهالەبەر خاتری تۆ.

چی بکەم ئەوڕۆژە پەیمانم دا بەحەسەن هاوکاری بکەم، بۆجارێکی تر کەوتمەوەسەر کرداری خراپ، ئەویش تەنها لەبەرخاتری دایکە پیرەکەی بۆئەوەی لەدنیای تاریك ڕزگاری بکەین.

لەوڕۆژە بەدواوە زۆربەی کاتەکان من و حەسەن بەدزیەوە خەریك بووین و شەوانیش دەگەڕامەوە کەلاوەکە و لەکولانەی سەگەکاندا دەخەوتم.

ڕۆژێکیان حەسەن بەخۆشحاڵیەوە هات بۆلام و وتی:

بێژەن ئەمشەو لەماڵێکدا دەست بەکار دەبین زۆر دەوڵەمەندە دڵنیابە پارەیەزۆرمان دەست دەکەوێت، چاوی دایکمی پێ چارەسەر دەکەم.

لەوەڵامدا وتم پێویستە ئاگامان لەخۆمان بێت چون ئەگەر ئەمجارە دەستگیر بکرێین سزای قورسمان دەدەن، ئەو لەوەڵامدا پێکەنی وتی:

بێژەن مەترسە. پاشان دەستمی گرت و کەوتینە ڕێ پاش ڕۆیشتن بەکۆلانەکاندا گەیشتینە گۆڕەپانی گەورەی شار کەمێك چوینە پێشەوە لەناکاو حەسەن بەرامبەر ماڵێکی گەورە راوەستا، ئەو ماڵەش پەنجەرەکانی هەمووی لە شەقامەکەوە دیار بوو.

وتی بێژەن ئێمە ئەم شەو لەم ماڵەدا دەست بەکار دەبین، هەر لەئێستاوە لەشوێنێکدا خۆت بشارەوە ئەم ماڵە بخەرە ژێر چاودێریەوە من دەڕۆمەوە شەو درەنگانێك دێمەوە بۆلات، پێکەوە دەچینە ژورەوە پاشان حەسەن بەپەلە جێی هێشتم و منیش لەبن درەختێکی سەرشەقامەکەدا دانیشتم.

ئەوکۆشکەی مەبەستمان بوو دەست بەکاربین تێیدا لەچوار نهۆم پێکهاتبوو، لەنهۆمی یەکەمدا دوو پەنجەرەی تێدابوو پەنجەرەکانیش دوو پەردەی پەمەیی ناسکی پێوە بوو، نهۆمی سەرەوەش هەورەبانێکی گەورەبوو بەچواردەوریدا بەپەرژینێکی ئاسنی جوان دەورە درابوو دووپەنجەرەی گەورەشی تێدابوو بەڵام پەنجەرەکان پەردەیان پێوە نەبوو بەباشی ژورەکان دیاربوون بە سەقفی ژورەکانەوە چل چرایەك (تریا) شۆڕ بوبوەوە لەبەرامبەر پەنجەرەکەشدا تاقێکی بچوکی تێدابوو لەناو تاقەکەشدا دوو گوڵدانی پڕ لە مێخەکی سپی جوانی تێدابوو، لەناوەڕاستی تاقەکەشدا چەندپەیکەرێکی تێدابوو لەنێوان پەیکەرەکانیشدا پەیکەری ڤینۆس بەجوانی دیاربوو، لەپشتی پەنجەرەکەشەوە کچێکی جلوبەرگ سوری جوان راوەستابوو سەیری سەرشەقامەکەی دەکرد.

لەوکاتەدا لەناکاو کەوتمە بیرکردنەوە حەسەن چۆن دەیەوێت بچێتە ناو ئەومالەوە هەرچەند بیرم لێدەکردەوە نەمدەزانی چۆن چۆنی بڕۆینە ژورەوە،

شەو درەنگی کرد سەرنجمدا حەسەن لەشەقامەکەدا بەرەو رووم دێت، مانگەشەو بوو تەنها جارێك پەڵە هەور دایدەپۆشی مانگەشەوەکە دونیای رۆشن دەکردەوە، کاتێك حەسەن نزیك بویەوە لێم بەسەرسامیەوە پرسیم لێی: چۆن ئەتوانی بچیتە ناو ئەومالەوە لەپەنجەرەکەوە ناتوانیت سەربکەویت دیوارەکانیشی زۆر بەرزە سەرکەوتن بەدیوارەکانیدا مەحاڵە.

حەسەن بەپێکەنینەوە وتی: زۆر خۆت ناڕەحەت مەکە زۆر بەئاسانی و بەبێ دەردی سەر بەقاپیەکەدا دەچینە ژورەوە.

بەپەلە وتم حەسەن تۆ شێت بویت چۆن ئەتوانیت ئەو دەرگا ئاسنیە بەوگەورەییە بکەیتەوە؟

حەسەن بەنەرمیەکەوە وتی پێویست ناکات بیکەینەوە دەرگاکە خۆی کراوەیە.

لەقسەکانی تێنەگەیشتم وتم حەسەن چۆن دەرگاکە خۆی کراوەیە؟ ئەویش لەوەلامدا پێکەنی و وتی:

بێژەن درۆت لەگەڵ ناکەم و دەرگاکە خۆی کراوەیە و بەبێ دەردی سەر ئەچینە ژورەوە ، نۆکەری ئەو ماڵە برادەرمە هەموو رۆژێك بەدەست خاوەن ماڵەکەیەوە سکاڵا لای من دەکات و دەڵێت خاوەن ماڵەکەم زۆر ناڕەحەتم دەکات، هەر دوێنێ بوو هات بۆلام و پێی وتم ئەمەوێت خۆم بکوژم بۆنەوەی رزگارم ببێت، چونکە ئەمڕۆ کاتێك سەرکەوتم بەقادرمەکان دا پالی پێوەنام و لەو بەرزاییەوە خستمیە خوارەوە

ئەوەندە سەرم بەتوندی دای بەزەویدا ئێستا لەتاو ژانەسەر خەریکە بمرم، نازانم چی بکەم.

. بێژەن منیش پێم ووت لەوبەتبەختیە رزگارت دەکەم بەومەرجەی گوێ بۆقسەکانم شل بکەیت، ئەویش وتی هەرچی بڵێیت بەگوێت ئەکەم منیش وتم ئەبێت شەوی یەکشەممە دەرگاکە کراوەبێت چون دێم بۆدزی کردن و هەرچیەکم دەست کەوت بەیەکەوە دابەشی دەکەین ئەویش بەقسەکانم رازی بوو، ئێستاش دڵنیام دەرگاکەی دانەخستوە، زوکە تاتەواو درەنگی نەکردووە.

خێرا کەوتمە دوای حەسەن بەوشێوەیەی حەسەن وتی دەرگاکە دانەخرابوو حەسەن بەئارامی دەرگاکەی کردەوە و هەردوکمان چوینە ژورەوە دنیا کش و مات بوو ناوەڕاستی حەوشەکە حەوزێکی گەورەی تێدابوو، لەلای چەپی حەوزەکەوە پەیکەرێکی جوان دانرابوو بەسەرشانی پەیکەرەکەوە دوو فریشتەی بچوکی پێوەبوو تاجێکی گەورەیان دەنایە سەر پەیکەرەکە، لەناو ئاوەکەشدا مراوی گەورە و بچوك خەریکی مەلەکردن بوون گەرچی هەموو گڵۆپەکان کوژابونەوە بەڵام لەبەر روناکی مانگەشەوەکەدا دەمان توانی هەموو شتێك ببینین.

من و حەسەن بەهێواشی چوینە پێشەوە لەدەورووپشتماندا درەخت گەلێکی زۆری لێ بوو بەنێوانیاندا تێپەڕین و نزیك بوینەوە لەماڵەکە بەقەراغ دیوارەکانەوە گوڵی نیلو فەری زۆریان رواندبوو لەبەر روناکی مانگە شەوەکە و شنەی باکە سەمایان دەکرد.

لەپێش رەویدا بوین حەسەن دەستی درێژکردوو چڵێك لەوگوڵە جوانانەی کردەوە و دایبەدەستمەوە منیش بەبینینی لەبەرخۆمەوە وتم ئۆ چ گوڵێکی جوانە بەڵام ئەفسوس ئەمگوڵانە تەنها یەك شەو تەمەن

دەکەن، لەڕاستیدا ژیانی ئەوگولانە زۆر کەمە خۆزگە حەسەن ئەوگوڵەی لێنەدەکردەوە لەبەر ئەوەی پاش ماوەیەکی کەم سیس دەبێت ئەم گوڵانە لەتاریکیدا شنە دەکەن بەیانی تیشکی خۆرەتاو لەناویان دەبات تەنهالەتاریکیدا ژیان بەسەر دەبەن.

لەوکاتەدا حەسەن وتی قسەمەکە زوکە بادەست بەکار بین درەنگە.

پاشان بەرەو پێش ڕۆیشتین و نزیك بوینەوە لەماڵەکە، حەسەن بەدەستی بەرەو لای چەپ ئاماژەی کرد و وتی: بێژەن تۆ هەر لەم ڕێڕەوەدا رادەوەستی من دەچم شوێنەکانی تری دەگەڕێم هەرچیەکم دەست کەوت پێتی دەدەم و پاشان رادەکەین کاتێك گەیشتینە ڕاڕەوەکە من لەگۆشەیەکدا راوەستام و ئەویش بە پسکە پسك بەرەو پێشەوە ڕۆیشت.

لەوکاتەدا لەناکاو گوێم لە دەنگێکی ناسك بوو دەیگووت تکات لێدەکەم بفەرموون ماڵی خۆتانە گەورەتان کردوین بفەرموون ماڵی خۆتانە.

لەم کاتەدا لەترساندا تەواوی لەشم دەلەرزین سەیری هەرلایەکم دەکرد کەسم نەدەبینی وەکو شێت کەوتمە راکردن و کاتێك گەیشتمە حەوشەکە بۆئەوەی لەدەرگاکە دەربچم لەپشتەوە حەسەنم بینی کراسەکەی گرتم و بەدەنگێکی بەرز پێکەنی.

بەتوڕەییەوە وتم حەسەن تۆشێت بویت، ئێستا کەی کاتی شۆخی و گاڵتەکردنە ئێستا دەمان گرن وەرە باڕابکەین.

بەپێکەنینەوە وتی بێژەنی ترسنۆك بۆچی رابکەین ئەودەنگە پێی ووتین بفەرمون ماڵی خۆتانە دەنگی توتی بوو بۆلەخۆمانەوە رابکەین.

پاشان من و حەسەن چوینەوە حەوشەکە و بەپەلە خۆمان کردەوە بەماڵەکەدا و حەسەن چوە ڕاڕەوەکە و من بەبڕیاری ئەو لەدەرەوەی ڕاڕەوەکە واتە لەحەوشەکەدا ڕاوەستام پاش چارەکێك لەناکاو گوێم لە غەڵبە غەڵبێك بوو ویستم لەنێوان درەختەکاندا خۆم بشارمەوە لەناکاو دەنگی فیشەکێك هات و بەدوایدا دەنگی حەسەنم بیست هاواری دەکرد بێژەن فریام بکەوە کوشتمیان.

گڵۆپی ڕاڕەوەکە داگیرسا ویستم ڕابکەم چاوم بە حەسەن کەوت لەڕاڕەوەکەدا کەوتوە نوقمی خوێن بووە ئیتر نەمتوانی ئەودیمەنە تەماشا بکەم بەپەلە خۆم گەیاندە شەقامەکە، شەقامەکە چۆڵ و هۆڵ بوو،

دیمەنە ترسناکەکەی حەسەن تەواو شێتی کردم سەیری هەرلایەکم دەکرد هەر ڕەنگی سوری خوێنم لێوە دیاربوو هەرچەند شەقامەکە کش و مات و بێ دەنگ بوو بەڵام دەنگی هاوارەکانی حەسەن کەداوای یارمەتی لێدەکردم لەهەموو لایەکەوە دەم بیست دەنگی هاوارەکانی لەدورترین شوێنەوە دەبیسترا.

لەوێ دورکەوتمەوە بۆئەوەی کەمێك هێور ببمەوە بەڵام بۆهەرشوێنێك بڕۆیشتمایە دەنگی هاوارەکانی حەسەن وەکو سێبەر بەشوێنمەوە بوو. چڵە گوڵەکەی حەسەن دابووی بەدەستمەوە هێشتا بەدەستمەوە بوو. ئێمە هەردوکمان پێکەوە بۆدزی ڕۆیشتین نەدەبوایە جێم بهێشتایە بەڵام هیچیشم پێنەدەکرا گەر بمویستایە یارمەتی بدەم منیش گرفتار دەبووم.

بەوحاڵە پەرێشیانەوە گەڕامەوە کەلاوەکە و چومەوە ناو کولانەی سەگەکانەوە سەگەکانیش لەکولانەکەدابوون چومە پاڵیانەوە و راکشام لەگەڵ سەگەکاندا ئاشنابوبوم بەبێ ترس دەچومە نزیکیانەوە.

راکشام دیسانەوە کەوتمەوە بیری حەسەن و دایکە پیر و بێ سەرپەرشتیارەکەی، کە لەلێواری کوێر بوندایە تابەیانی خەوم لێ نەکەوت،

لەکۆتایدا بەیانی رۆژ بویەوە سەرگەرم بووم بەفرۆشتنی جگەرەوە، لەدوکانەکان جگەرەم وەردەگرت لەسەر شەقامەکان دادەنیشتم و دەمفرۆشت رۆژانە سێ تمەنم دەست دەکەوت.

رۆژان بەسەختی تێدەپەری شەوێکیان کاتی رۆیشتنەوەم بۆکەلاوەکە سەرنجم دا سەگەکان لەناو کولانەکەدا نین زۆر سەرسام بووم چون مەحاڵ بوو شەو لەناو کولانەکەدا نەبن. دڵم داخورپا وامدەزانی شتێك رویداوە، بەپەلە لەکەلاوەکەدا دەستم بەگەڕان کرد پاش ئەوەی تۆزێك ئەملاو ئەولام کلاد لەناکاو چاوم بەسەگێکیان کەوت لەپشت کەلاوەکەدا کەوتوە بەپەلە چومە ژور سەری دەمی کراوەبوو نەدەجولایەوە.

چەندجارێك بانگم کرد هەرنەجولایەوە کاتێك لەبەر روناکی مانگەشەو سەرنجم دا زانیم بێگیانە.

کوشتبویان، دڵنیابووم کوشتویانە، بەبینینی ئەم دیمەنە سەرسام بووم لەکەلاوەکە هاتمە دەروە و لەشەقامەکان تەنها و سەرگەردان دەسوڕامەوە، ئەوشەوەش لەپەنا دیوارێکدا رۆژم کردەوە.

بەیانی دیسانەوە بێ ئامانج و بێ مەبەست کەوتمەوە رێ نزیکی دەمەو نیوەڕۆ سەرنج دەدەم لەگۆشەیەکی شەقامەکە ژمارەیەك خەڵك

کۆبونەتــەوە و قــسە دەکــەن، خــۆم گەیانــدە نزیکیــان، پیــاوێکی ئاڵەندازەیــەك گــەنج لــەنێوان کۆمەڵەکــەدا راوەســتابوو بــەدەنگی بــەرز دەیووت:

سەگەکەیان کوشتوم لەکاتێکدا سەگەکەم سەگێکی وێڵەکی نەبوو شکات دەکەم بۆچی ئەو سەگە بەنرخەی منیان کوشتوە؟

بەپەلە دورکەوتمەوە لێ یان چون ئەم قسانە دەوای دەردی دڵیان نەدەکردم، چەندهەنگاوێك دورکەوتمەوە لەناکاو لەسەر شەقامەکە چاوم بەبوخچەیەك کەوت کەمێك سەیری دەورو پشتم کرد کەس دیارنەبوو زانیم کەسم بەشوێنەوە نیە بەپەلە هەڵم گرت و دورکەوتمەوە لەوشوێنە.

لەکۆڵانێکی چۆڵدا بوخچەکەم کردەوە چاکەت و پانتۆڵێکی تازەی تێدایە لەئوتوکردن هێنابویانەوە. زۆر خۆشحاڵ بووم جلوبەرگەکانی خۆم داکەند و بەپەلە چاکەت و پانتۆڵەکەم لەبەر کرد کەمێك سەرو رخسارمی گۆڕی پاشان دەستم کرد بە رۆیشتن چاکەت و پانتۆڵەکە بەبەرم کەمێك گەورە بوو بەڵام زۆر تازە و جوان بوو.

لەوکاتەدا لەدورەوە چاوم بەپیاوێك کەوت بەدوای حەماڵدا دەگەڕا بەپەلە بەرەو روی رۆیشتم و وتم خاڵۆ دەڵێی بۆحەماڵ دەگەڕێی؟

وەڵامی دایەوە :بەڵێ دەمەوێت ئەم چەند پاکەتە میوە و ئەو سندوقە بچوکەم بۆبەرێتەوە بۆماڵەوە ماڵەکەشمان زۆردورنیە لێرەوە.

خێرا وتم من ئامادەم بۆت بەرمەوەپاشان پاکەتە میوەکە و سندوقە بچوکەکەم هەڵگرت و بردمەوە بۆماڵەوە کاتێك میوەکانم بردە ژورەوە چاوم بەپیرەژنێك کەوت و وتی کوڕم ناوت چی یە؟

وەڵامم دایەوە ناوم بیژەنە.

پاشـــان وتـــی بێـــژەن مانـــدوو دیاریـــت وەرە ژوورەوە باکـــەمێك بحەسێیتەوە پاشان بردمیە ژوورەوە و لەسەر کورسیەك دانیشتم و خۆی چوە دەرەوە پاش چەند خولەکێك پیرەژن بەڕوخۆشیەك هاتەوە ژوورەوە و یەك قاپ میوەی هەڵوژەی هێنا بۆم منیش دەست بەجێ دەستم کردبە هـــەڵوژە خـــواردن، فەرشـــێکی زۆرگـــەورە لەژوورەکـــەدا راخرابـــوو لەدەورو پشتمدا گەلێك پەیکەری گران بەهای تێدابوو، پاش ماوەیەك پیرەژنەکە بەڕویەکی خۆشەوە پرسیاری کردوو وتی کوڕەکە گیان رۆژانە بەچیەوە خەریکیت؟

وەڵامم دایەوە جگەرە دەفرۆشم.

وتی رازیت لەکارەکەت ؟

وەڵامم دایەوە نەخێر.

زەردەخەنەیەکی کرد و وتی دەتەوێت لەماڵی ئێمەدا کار بکەیت و مانگی شەست تمەنیشت پێدەدەم بەخۆشحاڵیەوە وتم بەڵێ ئامادەم.

دیسانەوە پرسی دایك و باوکت هەیە یان نە؟

کەمێك بێدەنگ بووم پاشان باوکە توڕەو قسە ناخۆشەکەی وەبیر هێنامەوە.

وەڵامم دایەوە نەخێر هیچ کەسێکم نیە نەدایك نە باوك نەسەرپەرشت هیچ کەسم نیە و هەر خۆمم.

لەوکاتـەدا پـیرەژن بـە روە خۆشـەکەیەوە بـانگی کـرد ئەسـغەر وەرە بۆئێرە ئیشم پێتـە، ئـەم کـوڕە ئامادەیـە لـەماڵی ئێمـە کـار بکات هیچ کەسیشی نیە تۆ پێت چۆنە؟

ئەسغەر ئاغاش لەژوورەکەیتەنیشتمانەوە وەڵامی دایەوە دایەگیان کە خۆی ئامادەیە منیش رازیم.

لەوڕۆژە بەدواوە لەماڵی ئەسغەر ئاغادا دەستم کرد بەکارکردن زۆریان خۆش دەویستم من واتای خۆشەویستیم نەدەزانی.

ئەسغەر و دایکی دوو مرۆڤی بەهرەمەند بوون لە تەواوی تەمەنم دا مرۆڤی وام نەبینی بوو، دوو مرۆڤی دڵ فراوان بوون. شەو و ڕۆژم لەپاڵ ئەواندا بەخۆشحاڵیەوە دەگوزەراند بێ ئەوەی بچوکترین ناڕەحەتی بچێژم، ڕۆژێکیان ئەسغەر ئاغا لێی پرسیم:

بێژەن خوێنەواریت هەیە؟

وتم بەڵێ تا پۆلی سێیەمی ناوەندی.

وەڵامی دامەوە پێویستە شەوانە بڕۆیت بۆ قوتابخانەی شەوانە و درێژە بەخوێندن بدەیت.

لەوڕۆژە بەدواوە هەموو شەوێك دەڕۆیشتم بۆ قوتابخانەی شەوانە.

دایکی ئەسغەر ئاغا بەڕاستی خۆشی دەویستم لەبەر ئەوەی ئەیزانی دایکم نیە هەمیشە پێی دەگوتم بەدایکە بانگم بکە چون بەقەدەر ئەسغەری کوڕم خۆشم دەوێت.

لەدوای مانگێك ڕۆژێکیان دەمەو ئێوارە ئەسغەر و دایکی ڕۆیشتن بۆ سینەما جگە لەمن هیچ کەس لەماڵەکەدا نەمایەوە کاتێك ویستم بڕۆم ژوری نهۆمی سەرەوە گسك بدەم سەرنجم دا قاپی پارە و ئاڵتونەکان کراوەیە هەموو ئاڵتونەکانی دایکی ئەسغەریش لەسەر مێزەکەیە زۆر سەرسام بووم لەبیر و هۆشی ئەسغەر و دایکی.

ئاخر هەرچۆنێك بوو من نۆکەرێکم نەدەبوو ئەوان بەو ئەندازەیە لەمن دڵنیابونایە، بەپەلە ئاڵتونەکانم لەسەر مێزەکە هەڵگرت و خستمە ناو کانتۆرەکەوە، زۆر خۆشحاڵ بووم لەوەی کە بەوئەندازەیە لەمن دڵنیان ئەم بابەتەش زیاتر دڵئەستوری کردم. لەبەر ئەوەی بەتەنها من لەو

ماڵەدابووم دەرگاکانم داخست و لەژورەکەدا دانیشتم چونکە دیواری ماڵەکە زۆر نزم بوو ترسام نەوەك کەسێك بەمەبەستی دزی کردن خۆی بکات بەژوردا و ماڵەکە کاول بکات. دڵنیابونەکەی ئەوان لەمن زیاتر ناچاری کردم بەدڵسۆزیەوە پارێزگاری لە سەروەت و سامانیان بکەم.

پاش دووسەعات سەرنجمدا لەدەرگا دەدرێت خێرا دەرگاکەم کردەوە دایکی ئەسغەر بەتەنها هاتەوە بۆماڵەوە کاتێك چاوی بەگوڵەکان کەوت بینی ئاوم نەداون وتی:

بێژەن بۆچی ئاوی گوڵەکانت نەداوە ئەم دوسەعاتە ئێمە لەماڵ نەبووین تۆ هیچ کارێکت نەکردووە.

وەڵامم دایەوە بەڵێ ئەم دوسەعاتەی ئێوە لەماڵەوە نەبوون من هیچ کارێکم نەکردووە لەبەر ئەوەی کاتێك چومە نهۆمی سەرەوە بۆگسك دان ئاڵتونەکانی تۆم بینی بەسەر مێزەکەوە و دەرگای کانتۆرەکەش دانەخرابوو لەبەر ئەوەی تەنها منیش لێرەبووم ترسام نەوەك دز بێتە ژورەوە و پێی نەزانم هەتا گەڕانەوەی ئێوە لەوێدا مامەوە وەك پاسەوان. ئێستاش زۆر درەنگ نیە گڵۆپی حەوشەکە دادەگیرسێنم و گوڵەکان ئاو دەدەم بەڵام ئێوەش هەرکاتێك چونە دەرەوە دەرگای ئاڵتون و پارەکان دابخەن.

لەوکاتەدا زەردەخەنەیەکی کرد و وتی لێگەڕێ ئەم شەو ئاویان مەدە وەرە بابڕۆینە ژورەوە، پاشان دەستمی گرت و چوینە ژورەوە سەرنجمدا ئەسغەر لەژورەوەیە خەریکی خۆگۆڕینە زۆر سەرسام بووم.

خۆ ئەو لەگەڵ دایکیدا رۆیشتبوو بۆ سینەما لەگەڕانەوەیاندا کاتێك کەدرگاکەم کردەوە جگە لەدایکی ئەسغەر کەسی ترم نەبینی ئەی چۆن ئەسغەر هاتوەتە ژورەوە و من پێم نەزانیوە، بەسەر سامیەوە وتم:

دایە گەورە مەگەر تۆ لەگەڵ کاک ئەسغەردا نەڕۆیشتوی بۆ سینەما؟

بێ ئەوەی وەڵامم بداتەوە رۆیشتە دەرەوە پاشان لە ئەسغەر ئاغام پرسی مەگەر تۆ لەگەڵ دایکتدا بۆ سینەما نەڕۆیشتبووی؟ کەی گەڕایتەوە بۆماڵەوە وامن ئاگام لێ نەبوو؟

ئەسغەر ئاغا بەپێکەنینەوە وتی بێژەن من نەڕۆیشتم بۆ سینەما لەماڵەوە مامەوە دایکم بەتەنها رۆیشت بۆ سینەما مانەوەکەشم لەماڵەوە لەبەر هۆیەك بوو ئەویش تاقی کردنەوەی تۆ ئاخر هەر نۆکەرێکمان دەگرت پاش ماوەیەك دز دەردەچوو. پاش ماوەیەك وتی دوێنێ شەو بەدایکمم وت با بێژەنیش تاقی بکەینەوە تابزانین ئەویش وەکو نۆکەرەکانی تر دزە یان نە.

دایکم وەڵامی دایەوە و وتی بێژەن خوێنەوارە و وانازانم کاری وابکات تازە بێژەن کوڕی خۆمانە مەحاڵە خیانەتمان لێ بکات. بەڵام من هەردەمگووت پێویستە تاقی بکەینەوە جگە لەوەش هیچ چارەیەکم نەبوو ئەمڕۆش هەروەك ئەو نەخشەیەی دامان نابوو دایکم رۆیشت بۆ سینەما و منیش لەنهۆمی خوارەوە خۆم شاردەوە تۆش بەم هەڵوێستەت سەلماندت کوڕێکی پاکیت ئیتر لەمڕۆبەدواوە ئەم ماڵە ماڵی خۆتە.

لەوکاتەدا دایە گەورە بەقاپێك گێلاسەوە خۆی کرد بەژووردا و بەپێکەنینەوە وتی بێژەن تۆ کوڕی خۆمیت هیواداریشم لەوکردەوەمان ناڕەحەت نەبیت و پاشان هاتە پێشەوە و بیست تمەنیەکی پێدام و وتی وەرە پێشەوە گێلاسەکەت بخۆ.

لەو رۆژە بەدواوە سات لەدوای سات خۆشەویستر دەبووم لایان ئەو کاتانەشی لەخوێندنەکەم دەگەڕامەوە تا درەنگانێك ئەسغەر ئاغادەرسی

ماڵەدابووم دەرگاکانم داخست و لەژورەکەدا دانیشتم چونکە دیواری ماڵەکە زۆر نزم بوو ترسام نەوەك کەسێك بەمەبەستی دزی کردن خۆی بکات بەژوردا و ماڵەکە کاول بکات. دڵنیابونەکەی ئەوان لەمن زیاتر ناچاری کردم بەدڵسۆزیەوە پارێزگاری لە سەروەت و سامانیان بکەم.

پاش دووسەعات سەرنجمدا لەدەرگا دەدرێت خێرا دەرگاکەم کردەوە دایکی ئەسغەر بەتەنها هاتەوە بۆماڵەوە کاتێك چاوی بەگوڵەکان کەوت بینی ئاوم نەداون وتی:

بێژەن بۆچی ئاوی گوڵەکانت نەداوە ئەم دوسەعاتە ئێمە لەماڵ نەبووین تۆ هیچ کارێکت نەکردووە.

وەڵامم دایەوە بەڵێ ئەم دوسەعاتەی ئێوە لەماڵەوە نەبوون من هیچ کارێکم نەکردووە لەبەر ئەوەی کاتێك چومە نهۆمی سەرەوە بۆگسك دان ئاڵتونەکانی تۆم بینی بەسەر مێزەکەوە و دەرگای کانتۆرەکەش دانەخرابوو لەبەر ئەوەی تەنها منیش لێرەبووم ترسام نەوەك دز بێتە ژورەوە و پێی نەزانم هەتا گەڕانەوەی ئێوە لەوێدا مامەوە وەك پاسەوان. ئێستاش زۆر درەنگ نیە گڵۆپی حەوشەکە دادەگیرسێنم و گوڵەکان ئاو دەدەم بەڵام ئێوەش هەرکاتێك چونە دەرەوە دەرگای ئاڵتون و پارەکان دابخەن.

لەوکاتەدا زەردەخەنەیەکی کرد و وتی لێگەڕێ ئەم شەو ئاویان مەدە وەرە بابرۆینە ژورەوە، پاشان دەستمی گرت و چوینە ژورەوە سەرنجمدا ئەسغەر لەژورەوەیە خەریکی خۆگۆڕینە زۆر سەرسام بووم.

خۆ ئەو لەگەڵ دایکیدا رۆیشتبوو بۆ سینەما لەگەڕانەوەیاندا کاتێك کەدرگاکەم کردەوە جگە لەدایکی ئەسغەر کەسی ترم نەبینی ئەی چۆن ئەسغەر هاتوەتە ژورەوە و من پێم نەزانیوە، بەسەر سامیەوە وتم:

دایە گەورە مەگەر تۆ لەگەڵ کاک ئەسغەردا نەڕۆیشتوی بۆ سینەما؟

بێ ئەوەی وەڵامم بداتەوە ڕۆیشتە دەرەوە پاشان لە ئەسغەر ئاغام پرسی مەگەر تۆ لەگەڵ دایکتدا بۆ سینەما نەڕۆیشتبووی؟ کەی گەڕایتەوە بۆماڵەوە وامن ئاگام لێ نەبوو؟

ئەسغەر ئاغا بەپێکەنینەوە وتی بێژەن من نەڕۆیشتم بۆ سینەما لەماڵەوە مامەوە دایکم بەتەنها ڕۆیشت بۆ سینەما مانەوەکەشم لەماڵەوە لەبەر هۆیەك بوو ئەویش تاقی کردنەوەی تۆ ئاخر هەر نۆکەرێکمان دەگرت پاش ماوەیەك دز دەردەچوو. پاش ماوەیەك وتی دوێنێ شەو بەدایکمم وت با بێژەنیش تاقی بکەینەوە تابزانین ئەویش وەکو نۆکەرەکانی تر دزە یان نە.

دایکم وەڵامی دایەوە و وتی بێژەن خوێنەوارە و وانازانم کاری وابکات تازە بێژەن کوڕی خۆمانە مەحاڵە خیانەتمان لێ بکات. بەڵام من هەردەمگووت پێویستە تاقی بکەینەوە جگە لەوەش هیچ چارەیەکم نەبوو ئەمڕۆش هەروەك ئەو نەخشەیەی دامان نابوو دایکم ڕۆیشت بۆ سینەما و منیش لەنهۆمی خوارەوە خۆم شاردەوە تۆش بەم هەڵوێستەت سەلماندت کوڕێکی پاکیت ئیتر لەمڕۆبەدواوە ئەم ماڵە ماڵی خۆتە.

لەوکاتەدا دایە گەورە بەقاپێك گێلاسەوە خۆی کرد بەژوردا و بەپێکەنینەوە وتی بێژەن تۆ کوڕی خۆمیت هیوادارییشم لەوکردەوەمان ناڕەحەت نەبیت و پاشان هاتە پێشەوە و بیست تمەنیەکی پێدام و وتی وەرە پێشەوە گێلاسەکەت بخۆ.

لەو ڕۆژە بەدواوە سات لەدوای سات خۆشەویستر دەبووم لایان ئەو کاتانەشی لەخوێندنەکەم دەگەڕامەوە تا درەنگانێك ئەسغەر ئاغادەرسی

پێدەگوتم بەتایبەتی ئەودەرسانەی زۆر قورس بوون، گەر شەوێکیش نەرۆیشتمایە بۆخوێندن دایە گەورە زۆر لێم توڕە دەبوو، ساڵ لەدوای ساڵ بەنمرەی بەرزەوە دەردەچوم، بەڕۆژدا لەگەڵدایەگەورە پێکەوە کاروباری ماڵەوەمان دەکردو لەپاش نیوەڕوانیش خەریکی ئاودانی باخچەکە دەبووم.

بەڕاستی ئەوان مرۆڤی ڕاستەقینەبوون، هەرگیز وابیرم نەدەکردەوە پەناهگایەکم دەست کەوێت، بەلاّم ئەوان بەهەڵوێستی دڵسۆزانەیان پێیان سەلماندم هەموو مرۆڤەکان دڵ ڕەق و بێبەزەیی نین. مرۆڤی دڵسۆز و بەهرەمەندیش هەیە، کاتێک دایە گەورە دەستی دەهێنا بەسەرمدا سەرسام دەبووم چون باوەڕم نەدەکرد لەم دونیایەدا کەسێک هەبێت دەستی سۆز و بەزەیی بهێنێت بەسەرمدا.

زۆربەی کاتەکان دایە گەورە لەگەڵ خۆیدا دەیبردم بۆ سەیران و پیاسە کردن شەوانەش لەپاڵ قەرەوێڵەکەی ئەودا دەخەوتم، گەر نەخۆشیش بکەوتمایە دەیبردم بۆنەخۆشخانە.

لەسەر مێزی نانخواردندا نانەکەی من لەپێشدا دادەنرا، هەمووساڵێک قاتێک چاکەت و پانتۆڵ و جوتێک پێڵاوی گران بەهای بۆدەکڕیم، مانگی شەست تمەن پارەشم وەردەگرت، هەندێ جاریش کە لە شت کڕین دەگەڕامەوە باقی پارەکەی دەدایەوە بەخۆم و پارەی خوێندنەکەشی بۆ دەدام، بەڕاستی مرۆڤی ڕاستەقینەبوون، لەوێدا درێژەم بەخوێندن دا هەندێ جاریش دایەگەورەم دەیبردم بۆ سینەما لە هەموشوێنێکدا بەکوڕی خۆی دەیناساندم ئەمەش بۆمن چون دایکم نەبوو جێگای خۆشحاڵی بوو.

ماڵەکــەیان لەشــەقامێکی درێــژدابوو لەتەنیــشتی ماڵەکەیانــەوە دوکانێکی شیرینی لیّ بوو، جگە لـەمن و دایـە گـەورە و ئەسغەر ئاغا کەسی تر لەوماڵەدا نـەدەژیا، ئەسغەر ئاغا دەستگیرانێکی هەبوو ناوی (لالە) بوو هەفتەی جارێك دەهات بۆماڵمان ئەویش خۆشی دەویستم.

هـەرکات دەهـات بۆماڵمـان پێـنج تمـەنی دەدامـیّ، دایـە گـەورەش پارەکانمی دەخستە بانقەوە.

ماوەی چوار ساڵ لەوماڵەدا ژیانم بەسەر برد وەکو منداڵی ئەو ماڵەم لێهاتبوو بەڵام ئەم خۆشحاڵیەم زۆری نەخایاند.

رۆژێکیان دایەگەورەم پێی وتم ماڵەکەمان فرۆشتوە بە بازرگانێکی گەورە و من و ئەسغەر و لالە دەڕۆین بۆ ئەوروپا.

ئەم هەواڵـە ئەوەنـدە نـاخۆش بـوو بەلامـەوە نەخۆشـی خـستم، بـەڵام دایەگەورە و ئەسـغەر ئاغـاش دڵنـەواییان دەدامـەوە و دەیـان ووت ئێمـە دوای چەندساڵێکی تر دەگەڕێینەوە و دەتهێنینەوە بۆلای خۆمان.

ئەمساڵ دەبوا بڕوانامەی دبلۆمم وەربگرتایا، ئەسغەر ئاغا هەمیشە ئامۆژگاری دەکـردم بـەردەوام بـە لەخوێنـدن. پـاش دومـانگ رۆیـشتن بـۆ ئەوروپا و منیان بردە لای قازی یەکی ناسراوی خۆیان.

ناتوانم بڵێم ئەو روداوە چەند ناڕەحەتی کردم، نزیکەی حەوت هـەزار تمەن پارەی ئەو چوارساڵە لەبانقدا کۆکرابوەوە بۆم.

پاش رۆیـشتنی ئـەوان لـەماڵی قازیەکـەدا سـەرگەرمی کـارکردن بـووم ماڵەکـەی قـازیش لـە هـەموو کۆشـکە رازاوەکـان بـەرزتر و خۆشـتر بـوو. قـازیش بـەناخێری زۆربــەی کاتــەکان لەماڵــەوە بـو کـوڕی قومـاری دەڕازاندەوە، هەندیّ شەویش لە کافتریا و ئوتێلە گران بەهاکاندا ژیانی بەسـەر دەبـرد و دەمــەو بـەیان لەگــەڵ خێزانەکەیـدا بەسەرخۆشـی

دەگەڕانەوە بۆماڵەوە تا ئەوکاتانەش من و چێشت لێنەرێکی تر کارمان دەکرد، بەڵام نانمان نەدەخوارد کاتێك بەخانمم دەگوت برسیمانە خێرا وەڵامی دەدایەوە ئەوەندەی ئەماوە رۆژ ببێتەوە جاریٚ بخەون بەیانی لەگەڵ ئێمەدا نانی بەیانی بخۆن، منیش تابەیانی لەبرساندا خەوم لێنەدەکەوت بەیانیش زوو بەمەبەستی شت کڕین لەخەو هەڵدەسام هەردوکانێك دەڕۆیشتم شتیان پێ نەدەفرۆشتم ناچار دەبووم بۆ کیلۆیەك گۆشت ماوەیەکی زۆر لەدوکانێکدا چاوەڕوان بومایە، بپاڕامەیەوە یان بڕۆشیتمایە بۆلای پاسەوانی سەر چوار رێگاکە بۆئەوەی تکام بۆ بکات بەڵکو شتم پێ بفرۆشێت، هەر شتێکیشم ببردایەتەوە پێنج جار دەیگەڕاندەوە پێم، تەواوی دوکاندارەکان لێم وەڕس بوبون هیچ کەس شتی پێ نەدەفرۆشتم.

لەبەر ئەوەی هەرشتێك دەمکڕی بەدەستوری خانم نەك یەکجار بەڵك و چەندین جار بەهانەی دەگێڕا و پێمی دەناردەوە، ئەمەش خۆی لەخۆیدا ئازاردانی خەڵکی یە نەشم دەزانی بۆچی وادەکات لەم ئازاردانەی خەڵکی چ چێژێکەوەردەگرێت.

بەناچاری لەوێدا کارم دەکرد.

رۆژێکیان دەمەو نیوەڕۆ لەدەرگایان داو منیش رۆیشتم دەرگاکەم کردەوە، چەند کەسێکی باڵابەرز و چوارشانەم بینی ئاشکرابوو لام لەدێهاتەوە هاتبوون، یەکێکیان هاتە پێشەوە و پێی وتم:

کارمان بە جەنابی قازی یە.

لەم کاتەدا جەنابی قازی هاتە بەردەرگا و بەبینینی ئەو چەند کەسە بەتوڕەییەوە هاواری کرد:

هـەتیوە کـەرە بۆچـی دەرگـات بـۆ ئەوچـەند کەسـە بێویژدانـە کردوەتەوە؟

کاتێك ئەمەم بینی خێرا دەرگاکەم لێداخستن.

جـەنابی قـازیش لەپـشت دەرگاکـەدا راوەسـتابوو دەنگـی بـەرزتر کردەوە بۆئەوەی گوێیان لیّ بێت قیڕاندی:

بێژەن بۆچی دەرگا لـەو پیاو کوژانە دەکەیتەوە ئەوان خوێن مژن نابێت دەرگایان لیّ بکەیتەوە، ئەوپیاو خراپانە دەرەبەگن و پیاوانی ژێر دەستەی خۆیان دەکوژن و منداڵـە هـەتیو کـەوتوەکانیان بۆ هەمیشە بیّ سەرپەرشت دەکەن، پاش تەواو بوونی قسەکانی چوە ژورەوە.

دوبـارە زەنگـی دەرگاکـە لێدرایـەوە و دەرگاکـەم کـردەوە یـەکێك لەوپیاوە دەرەبەگانـە بردمیـە کـەنارەوە و چپاندی بەگوێمدا بەجـەنابی قازی بلّیّ بەدەستی بـەتالّ نـەهاتوین، بۆبەوشێوەیە رەفتارمان لەگـەلّ دەکات بوار بدات بابێینە ژورەوە.

منیش خێرا چومە ژوری قازی و ئەوانەی پێم ووترا بەجـەنابی قـازیم راگەیاند.

کاتێـك جـەنابی قـازی بـۆی رون بویـەوە بەدەسـتی بـەتالّ نـەهاتون زەردەخەنەیەکی کرد و وتی:

بێژەن برۆ بەرێزێکی زۆرەوە رێنمویان بکە بۆ ژورەکەم.

منـیش رێنمـونیم کـردن بـۆ ژورەکـەی قـازی و خۆشـم لەگۆشـەیەکدا راوەستام بۆئەوەی ئەگەر کارێکیان هەبێت ئەنجامی بدەم.

جەنابی قازی هاتـە ژورەوە و هـەمویان لەبەری هەستانەوە و پاشان روی تێکردن و وتی: تکادەکەم فەرموون دانیشن.

هەمویان لەسەر کورسیەکان دانیشتن جەنابی قازیش لەبەرانبەریاندا دانیشت، پاشان یەکێك لەو دەرەبەگانە بڕێکی زۆر پارەی خستە بەردەم جەنابی قازی نزیکەی سەد هەزار تمەن دەبوو.

جەنابی قازی لەگەڵ چاوی بە پارەکە کەوت بەپەلە وتی سوپاستان دەکەم داوای لێبوردن لەگشتان دەکەم چون نەمزانی ئێوە ژمارەیەك دز و جەردە و لکی بەرچاوی کۆمەڵگاتان کوشتوە، ئێوە خوێن مژ نین بەڵکو مرۆڤ گەلێکی دڵسۆز و خۆبەخت کەرن، بەو خۆبەخت کردنەتان کۆمەڵێك دز و چەتەو ناکەس بەچەتان کوشتوە، بەم فیداکاریەش ناوترێت جنایەت و خوێن ڕێژی، بەڵکو ئەم کردارە پێی دەوترێت گیانی لەخۆ بوردەیی، من بەباشی دەزانم تاقە یەك دز گیروگرفت بۆ کۆمەڵگایەك دروست دەکات، ئەگەر کۆمەڵگایەك بیەوێت پێش بکەوێت پێویستە بەهاوکاری کردنی یەکتری هەموو دزەکانی ناو کۆمەڵگا لەناو بەرن، ئەوکاتە دەتوانن کامەرانی و بەختەوەری بۆناو کۆمەڵگاکەیان دەستەبەر بکەن.

لەوکاتەدا دەمانچەیەکی بچوك لەسەر مێزەکەدا بوو هەڵی گرت و ڕوی کردە ئامادەبوان و وتی:

بەڕێزان شەوێکیانە بەسەرداں چووم بۆماڵی هاوڕێکەم هەر ئەوشەوە دوو دزی بێویژدان بەمەبەستی دزی کردن هاتبونە ئەوماڵە بەم دەمانچەیە یەکێکیانم کوشت و ئەویتریان هەڵهات و دەرباز بوو ئێستا ماوەیەکی زۆرە بەدوایدا دەگەڕێم بۆئەوەی سزای بدەم دواتریش تێگەیشتم نۆکەری ماڵەکەم هاوکاری دزەکان بووە ئەویشم کردە زیندانەوە بۆماوەی سێ ساڵ، من زۆر خۆشحاڵم کە لەتەمەنمدا دزێکم کوشتوە و ئەم دونیایەم لێ ڕزگار کردووە تا کۆتایی تەمەنیشم بەیادی

ئەو شەوەوە ئەم دەمانچەیەم هەڵدەگرم و دەیپارێزم بۆئەوەی هەموو خەڵك بزانێت مەبەستی من لەم دونیایەدا لەناوبردنی کەسانی خراپ و دزە.

کاتێك ئەمانەم بیست کوتوپڕ سەرم گێژی خوارد خەریك بوو بکەوم ژورەکە لەبەر چاومدا دەسوڕایەوە ویستم هاوار بکەم و بڵێم ئەوشەوە تۆ حەسەنی بێچارەت کوشت بەڵام ئەی خۆت پاکیت ئەگەر حەسەنی داما و لەشەوانی تاریکیدا دزی کردبێت تۆ بەڕۆژی روناك دزی دەکەیت.

ئەگەر ئەو لەبەر بڕێك پارەی کەم دزی کردبێت بەڵام ئەی خۆ تۆ بەفەردە پارە لەخەڵکی وەردەگریت و هەمویسشی لەشەوێکدا لەسەر مێزی قومارکردن دەدۆڕێنیت، کەواتە جیاوازی تۆ و حەسەن چی یە؟ ئەو لەبەر ناچاری و برسیەتی دزی دەکرد هەرچۆنێك بێت بەدەستی تۆ کوژراوە بەڵام جەنابی قازی تۆ لەبەر خۆش گوزەرانی دزی دەکەیت.

بەڵام هەرگیز توانای ئەوەم نەبوو ئەم قسانە لەبەردەم قازیدا بکەم لەبەر ئەوەی زۆر بەتوندی سزای دەدام.

پاش نیو سەعات دەرەبەگەکانی لادێ ویستیان بڕۆن و جەنابی قازی بانگی کردم و وتی: وەرە بێژەن کارم پێتە.

بەهێواشی رۆیشتەمە پێشەوە لەبەرامبەری دا راوەستام روخساری وەك پیاوکوژێکی دژوار دەهاتە پێش چاو.

لەبەر ئەوەی دەسەڵاتی خۆی لەبەرام بەر دەرەبەگەکاندا نیشان بدات چەندین جار قسەی ناشیرینی پێ وتم، پاشان زللەیەکی گەورەی لێدام و بە دەنگێکی بەرزەوە هاواری کرد:

کەرە بۆچی درەنگ هاتی ئەم بەڕێزانە دەیانەوێت بڕۆن ڕێنمونیان بکە پاشان ڕوی کردە ئەوان و وتی:

بەڕێزان متمانەی تەواوم پێتانە ئەگەر کەسانی هاوشێوەی خۆتان شك دەبەن و کە گیروگرفتیان هەبێت بینێرن بۆلام بۆئەوەی کارەکانیان بۆ ڕێك بخەم بەلام ئەوەش بزانن ئەبێت ئەوانیش وەکو ئێوە بزانن کارەکانی خۆیان جێ بەجێ بکەن، ئایا لەمەبەستەکەم تێدەگەن یان نە؟

یەکێکیان وەلامی دایەوە ئەی چۆن تێناگەین مەبەستت چی یە پاشان خواحافیزیان کردوو ڕۆیشتن.

جەنابی قازیش چون پارەی دەست کەوتبوو سفرەی قوماری دەڕازاندەوە ئەو پارانەی کە خوێنی ژمارەیەك ڕەش و ڕوت و برسی بوو لەسەر مێزی قوماردا دەیدۆڕاند، ئەگەر نوسینگە خێرخوازەکان داوای بڕێکی کەمیشیان لێ بکردایە بە وشەی ناشیرین دەری دەکردن، خۆراکی ئەوەندە لە فرێزەردا دەهێشتەوە کە کارمەندانی شاردوانی ناڕەحەت دەکرد و دەبوایە فرێیان بدایە بۆ دەرەوەی شار. بەلام ئەگەر کەسێك لەنزیك ماڵەکەیاندا لەبرساندا بمردایە هەرگیز پارویەك نانی نەدەدایە، هەمیشە لەبیری ئەوەدا بوو ئەو فایلانەی لەبەردەستیدایە قازانجەکەی چۆن دەبێت، ئەگەر فایلێکیان پێ دایە و سودی نەبوایە لێی نەدەپرسیەوە مافی زەوت لێکراوی نەدەسەندەوە.

هەرچۆنێك بوو پاش ماوەیەك بیستی شەوانە دەرس دەخوێنم لەبەر ئەو هۆیەش ئەوەندە کاری زیادەی دەدا بەسەرمدا کاتم بۆ نەمایەوە دەرس بخوێنم، هەمیشە پێی دەوتم لەماڵی مندا نابێت دەرس بخوێنیت لەبەر ئەوەی کاتێك دەرس دەخوێنیت ناتوانی کار و بارەکانی ماڵەوە ڕاپەڕێنی.

کاتێك بارودۆخەکەم بەوشێوەیە بینی بەبێ پرسی جەنابی قازی و خانمەکەی هاتمە دەروە و ئیتر نەگەڕامەوە.

پاش گەڕانێکی زۆر بۆ کار پەیدا کردن لە گەراجێکدا بووم بە نوسەر، خاوەنی گەراجەکە حاجیەکی پیر بوو رۆژانی سەرەتا بەمیهرەبانیەوە لەگەڵم دەجولایەوە بەلام پاشماوەیەك زانیم هیچی لەجەنابی قازی کەمتر نی بە.

زۆربەی کات هانی دەدام بۆئەوەی دزی بکەم بەلام هەرچۆنێك دەبوو رازیم دەکرد و دەم گووت:

جەنابی حاجی ناتوانم دزی بکەم تۆ لەهەموو کەس باشتر دەزانیت خوای گەورە چەند قینی لە گوناه کارانە دزیش گوناهێکی گەورەیە، تۆ ئەبێت لەهەموو کەسێك زیاتر ئاگات لەخوا بێت مسوڵمانی راستەقینە ئەوکەسەیە خوا لەبەر چاو بگرێت. دزی رەوشتێکی ناشیرین و خراپە بەهەر نرخێك بێت ئامادە نیم ئەو کردەوە ناشیرینە بکەم.

ئەویش هەمیشە لەوەڵامدا دەیگوت:

تۆ دزی بکە گوناهەکەی بە ئۆباڵی من ئەو بارانەی دەیهێنن بۆ ئێرە قورستر حسابی بکە پارەی تێچونیش کەمتر بنوسە تۆ نوسەری گەراجەکەیت دەتوانیت هەرچۆن حەز بکەیت دزی بکەیت.

بەلام من هەر بەرپەرچم دەدایەوە و هیچ حسابێکم بۆ قسە پرو پوچەکانی نەدەکرد.

تا ئەوکاتەی پاش گەڕانێکی زۆر بەدوای رابردوی مندا بەو راستیەی زانی چەند ساڵێك بەر لەئێستا لەسەر دزی کردن زیندان کراوم ئەم بابەتەش وای کرد زیاتر سەر بخاتە سەرسەرم بۆئەوەی دزی بکەم.

رۆژێکیان زۆر بێزار بوو بەدەستمەوە وتی:

بێژەن بۆچی هاوکاری من ناکەیت سوێندبێت بەخوا بەڵێنت پێدەدەم ئەوەی دەستمان کەوت دەیکەین بەدوکەرتەوە.

جەنابی حاجی پێنج جار حەجی کردبوو هەموو نوێژەکانی دەکرد هەموو کاتێك و لە هەموو شوێنێکدا باسی خوای گەورەی دەکرد بەریشسپی گەڕەکیان دەزانی، دەنگی خوا پەرستیەکەی لەگشت لایەکەوە دەنگی دابوەوە، لەگەڕەکدا هەرکەس بیویستایە کارێکی خێر ئەنجام بدات دەبوایە پرسیان بەو بکردایە، گەر کەسێك لەگەڕەکدا بمردایە وەکەسی نەبوایە سامانەکەیان دەسپارد بەدەستی حاجی بۆئەوەی خەرجی بکات لەکاری خێردا، حاجی بەهۆی ریشە سپیە درێژەکەیەوە و عەباکەی سەرشانی رێزی زۆری لێ دەگیرا، هیچ کەس باوەڕی نەدەکرد حاجی بەو پیرۆزیەوە بەو خوا ناسیەوە تا ئەو ئەندازەیە خوا نەناس و دز بێت.

حاجی تا ئەو ئەندازەیە جێگەی متمانەی خەڵکی گەڕەك بوو کەچی هەمیشە بەمنی دەگوت:

بێژەن پێویستە تۆ وەك لەمەو پێش و دزی بکەیت؛ بەردەوام بیت لەبەر ئەوەی تەنها رێگەیەك بۆ دەست کەوتنی پارە هەر دزی یە مەگەر ناتەوێت دەوڵەمەند ببیت، حەزناکەیت وەکو خەڵکی لەماڵی بەرز و رازاوەدا ژیان بەسەر بەریت؛ وەرە لەگەڵ مندا هاوکاربە پێشتریش خۆ هەر دز بوویت.

هەمیشە لەوەڵامدا دەم گووت:

جەنابی حاجی راست دەکەیت پێشتر دز بووم بەڵام ئێستا نامەوێت دزی بکەم ئەوکاتەش دزیم دەکر پێویستم بوو بەڵام خۆ نابێت هەتا

هەتایە هەر دزبم و دزی بکەم، حەز دەکەم دەوڵەمەند ببم بەلاّم نەك لەڕێگەی دزی کردنەوە.

بەلاّم جەنابی حاجی هەر گوێی نەدەدایە قسەکانی من، تەنها بە رابردوی رەشم دەیویست ئایندەشم نابوت بکات. هەر رۆژە و بەبیانوییەك سەرپێچیم لە حاجی دەکرد، ئەوەندەشی نەمابوو بۆ تاقیکردنەوە دەرەکییەکان زۆربەی کاتەکان خەریکی دەرس خوێندن بووم، ژورێکی بچوکیشم لەخواروی شاردا بەکرێ گرتبوو تا ئەندازەیەك ژیانم ئاسودەبوو.

تا رۆژێکیان بەرەو ماڵ دەگەڕامەوە لەناکاو چاوم بە جەنابی قازی کەوت بەپەلە روم وەرچەخاند بەلاّم چاوی پێم کەوت و بەپەلە یەخەی کراسەکەمی گرت و بەتوڕەییەوە وتی:

هەتیوی بێ حەیا بۆچی ماڵی ئێمەت بەجێهێشت و رات کرد؟

وەلاّمم دایەوە جەنابی قازی لەماڵی ئێوە تەنها نۆکەر بووم نەك بەندە حەزم نەدەکرد لەوێ بمێنم من رام نەکردووە چون خەتام نەکردووە تا رابکەم.

بەبیستنی ئەم قسانە هاوارێکی کرد و بەدەنگی بەرز وتی لەماڵەکەم رادەکەیت و هێشتا ئەڵێیت خەتایەکم نەکردووە.

وەلاّمم دایەوە من بەندە نەبووم تا هەرکات بتەوێت ئازادم بکەیت وەیان تا کۆتایی تەمەنم ناچاربم لەماڵی ئێوە کاربکەم، جەنابی قازی من ئازادم هەرشوێنێك حەز بکەم دەڕۆم هیچ یاسایەکیش سزام نادات.

لەم کاتەدا بەتورەی یەوە وتی:

کەرە لەماڵەکەی مندا دزیت کردووە چۆن یاسا ناتوانێت سزات بدات تۆ دزیت بەخراپترین شێوە سزات دەدەم. چەداوەرو پاداشتی ئەو

هەموو چاکەیەی من ئاوا دەدەیتەوە دزیم لێدەکەیت وا دەزانیت ناتوانم بتدۆزمەوە.

یەکسەر دڵم داخورپا. وتم جەنابی قازی هەرگیز قسەی وامەکە لەبەر ئەوە دزیم لێ نەکردویت. تۆ لەهەموو کەس باشتر ئەو راستیە دەزانیت من بەبێ کرێ لەماڵی ئێوەدا کارم دەکرد چۆن رێگە بەخۆت دەدەیت تۆمەتی دزی بدەیتە پاڵ بێ تاوانێکی وەك من؟

لەوکاتەدا بەهێواشی سەری هێنایە پێشەوە و چرپاندی بەگوێمدا تۆ راست دەکەیت بەڵام ئەوخەتایەت سەد ئەوەندە لەدزی خراپترە بۆچی بەبێ پرس ماڵەکەی منت بەجێ هێشت؟

بەنەرمیەکەوە وتم جەنابی قازی هەرگیز وام نەدەزانی بەو کردەوەم ئەوەندە نارەحەت ببیت ئێستاش لەو گوناهەی کردوومە زۆر پەشیمانم و داوای لێبوردنت لێدەکەم هەرچی بوو رۆیی راستە من خراپم کرد بەڵام تۆ بەگەورەیی خۆت لێم ببورە.

لەوەڵامدا وتی پێویستە تۆڵەت لێ بکەمەوە تۆ خراپت کرد لەگەڵم وا دەزانی لەپاداشتی ئەو خراپەیە چاکەت لەگەڵ دەکەم لەکوێی ئەم دونیایەدا واباوە وەڵامی خراپە بەباشە بدرێتەوە؟ من وشەگەلی لێبوردن و گەورەیی ناناسم ئەم وشانە تەنها وشەی پڕو پوچن تەنها بۆ فێڵ کردنە لەخەڵکی. نەفام ئەوکەسەیە بەو وشانە فێڵی لێ بکرێت تۆ پێویستە زیندانی بکرێیت و پاداشتی کردەوەکەت لەزینداندا ببینی.

پاشان پۆلیسێکی سەر شەقامەکەی بانگ کرد و خستمیانە ناو تەکسیەکەوە بەرە و کەلانتەری بردمیان.

لە رێگەدا روخساری دادستان و پارێزگاران دەهاتەوە بیرم.

لە کەلانتەری جەنابی قازی لەتاو توڕەیی دەلەرزی و وتی:

ئەم هەتیوە دزە سێ مانگ لەمەو پێش پاش ئەوەی برێک ئاڵتون و پارەی دزیوە رایکردوە و ئەمڕۆ دۆزیمەوە و خێرا بۆ ئێرەم هێناوە. جەنابی سەرۆکی کەلانتەری سزای بدەن.

من لەسەر کورسیەکدا دانیشتبووم لەشەرمەزاریدا سەرم شۆڕ کردبوەوە. لەوکاتەدا سەرۆکی کەلانتەری وتی: کوڕەکە وەرە پێشەوە بزانم راستە دزیت کردووە؟

هەستامە سەرپێ و رۆیشتمە پێشەوە هەرکە سەرۆکی کەلانتەریم بینی ئاشنا کەوتە پێش چاوم کاتێك باشتر بیرم کردەوە. بیرم کەوتەوە سەرۆکی کەلانتەری یەکێکە لە هاوڕێ نزیکەکانی جەنابی ئەسغەر ئاغا، ئەویش بەباشی منی دەناسی ئەسغەرئاغاش زۆر تاریفی چاکەی منی لەلاکردبوو. زۆر خۆشحاڵ بووم.

سەرۆکی کەلانتەریش منی ناسیەوە بەسەرسامیەوە وتی بێژەن ئەوە تۆی راستە دزیت کردووە لەماڵی جەنابی قازی؟

وەڵامم دایەوە تۆ ئەسغەرئاغا ئەناسی لەماڵی ئەواندا چوار ساڵ کارم کردوە بێ ئەوەی بچوکترن خیانەتیان لێ بکەم. کاتێك ویستیان برۆن بۆ ئەوروپا یەك رەزامەند نامەی بە خەتی خۆی بۆمن نوسیوە واپێتی دەدەم.

دەستم کرد بە گیرفانمدا و خستمە سەر مێزی جەنابی سەرۆك کەلانتەری.

لەوکاتەدا سەرۆك لانتەری وتی بێژەن چاکت ئەناسم ئەسغەر و ئایکی باسی دەست پاکی تۆیان بۆکردووم پاشان روی کردە جەنابی قازی و وتی:

ئەم کوڕە چی لەتۆ دزیوە؟

جەنابی قازیش لەوەڵامدا وتی سێ مانگ لەمەو پێش بڕێك ئاڵتون و پارەی دزیوە و پاشان هەڵهاتوە.

سەرۆك کەلانتەری وتی چ جۆرێك ئاڵتونێك؟

جەنابی قازی وتی لەبیرم نەماوە. لەبەر ئەوەی ئەم روداوە سێمانگی بەسەردا تێ پەڕیوە بەباشی بیرم ناکەوێتەوە چ جۆرێك لە ئاڵتونەکانم نەماوە.

سەرۆکی کەلانتەری لەوەڵامدا وتی ئەی چ داواکاریەکت لەم کوڕە هەیە تا لە راپۆرتەکەدا بینوسم؟ ئاڵتونێك تۆ نەزانی چی بوە یان دەبوا هەر هەمان ئەو رۆژەی دزیەکەت لێکراوە کەلانتەریت ئاگادار بکردایەتەوە نەك ئێستا سێ مانگ بەسەریدا تێ پەڕیوە.

خۆ تۆ خۆت قازی ئەم شارەیت چاك لەیاسا دەزانیت نابێت گوزارشتی ئەوەندە ناتەواو بنێرین بۆ دادگا بەتایبەتی من کە سەرۆك کەلانتەریم و تۆش قازی شار، من ئەم کوڕە ئازاد دەکەم لەبەرنەوەی چاکی دەناسم ئەگەر بەڵگەی تەواوت هێنا دەستگیری دەکەینەوە و سزای دەدەین.

پاشان ئازادیان کردم، لەو داوە دژوارەی جەنابی قازی بۆی رشتبوم رزگارم بوو،

پاش هەفتەیەك تاقیکردنە دەرەکیەکان دەستی پێکرد و منیش سەرگەرم بووم بە تاقیکردنەوە رۆژانە لەماڵەوە دەمامەوە و دەرسم دەخوێند و پاش مانگێك بڕوانامەی دیبلۆمم وەرگرت، ئەمەش دەسکەوتێکی گەورەبوو بۆم، رشتەی سروشتم هەڵبژارد نمرەکانیشم زۆر بەرز بوون.

لەبەر ئەوەی تا ئەندازەیەك ژیانم خۆش بوبو كەمێكیش پارەم هەبوو كەوتمە گەڕان بەدوای نێرگس دا، چومەوە كەلاوە بچوكەكەیان بۆئەوەی بتوانم سەرەداوێكم دەست بكەوێت، كاتێك نزیك كەوتمەوە لەكەلاوەكە سەیرم كرد بەتەواوی روخاوە و شوێنەواریشی نەماوە، چومە لای دراوسێكانیان، زۆر بەئارامی لەدەرگام دا، پاش ماوەیەك پیرەژنێك دەرگاكەی كردەوە.

وتم داپیرەگیان ماوەیەك لەمەو پێش كەلاوەیەك لەنزیكماڵی ئێوەوە بور بەڵام ئێستا شوێنەواری نەماوە نازانیت ئەوكەسانەی لەوێدا دەژیان ئێستا لەكوێن؟

پیرەژن لەوەڵامدا وتی كوڕی خۆم ئەو خێزانە هەمویان مردن كەلاوەكەشیان وێران بوە. تەنها كەسێك بەناوی نێرگس لەو بنەماڵە ماوەتەوە ئەویش دەربەدەری سەرشەقامەكان بوو نازانم ئێستا لەكوێ یە بەڵام كوڕە گەورەكەم چەند مانگێك لەمەوبەر لەشەقامی قەسر بینویەتی كاتێك لێی پرسیوە نێرگس خانم چی دەكەیت ئەویش پێی وتوە لەم نزیكانەدا لەماڵە ئینگلیزێكدا رەنج بەرم، خێرا پێنج تمەنم دا بە پیرەژنەكە و بەپەلە خۆم گەیاندە شەقامی قەسر تا شەو لەوێدا سەرگەرمی گەڕان بووم بەڵام نەمدۆزیەوە.

گەرچی نێرگسم خۆش دەویست بەڵام زۆریش نەمدەتوانی بیر بكەمەوە لەكەسێك كە تایبەتە بەكەسێكی تر بەڵام بەزۆری لەو روانگەیەوە بەدوایدا دەگەڕام ئەگەر بێ پارەبوایە پارەی بدەمێ.

پاش ماوەیەك گەڕان لەو دەوروبەرەدا رۆژێك نێرگسم لەو شەقامەدا بینی گالیسكەی منداڵێكی رادەكێشا، بەپەلە چوم بەرەو روی كاتێك

نێرگس منی بینی چەند ساتێك بە تێرامانەوە سەیری کردم پاشان وتی:

بێژەن ئەوە تۆیت هەرگیز باوەڕناکەم زۆر گۆڕاویت.

خێرا دەستم گرت و وتم:

نێرگس بڵێ بزانم! شوت کردوە یان نا؟

وەلامی دایەوە بێژەن لەتەواوی ئەو ماوە زۆرەدا تەنها بیرم لەتۆ دەکردەوە شەو و ڕۆژ تۆم لەبەرچاودا بوو چۆن ئەبێ شوبکەم بەکەسێکی تر ئەگەر تۆش فەرامۆشت کردبم بڕیارم داوە هەرگیز شوبەکەسی تر نەکەم. نازانیت بێژەن چ ڕۆژانێکی سەختم بردە سەر تا سەرئەنجام لەماڵی ئینگلیزێکدا بووم بە ڕەنج بەر شەوانەش ئەڕۆشتم بۆ خوێندن ئێستاش تا پۆلی چوار خوێندەواریم هەیە لەوماوەیەشدا زمانی ئینگلیزی فێر بووم، بەکورتی بڵێم پێنج هەزار تمەنیشم لەبانکدا هەیە.

نێرگس زۆر لەڕادەبەدەر جوان بووبوو گەرچی خەم و پەژارەی پێشوی بەڕوخسارەوە دیاربوو.

وتم نێرگسی ئازیز تائەندازەیەك ژیانم خۆش بوە و حەوت هەزار تمەنیشم لەبانکدا هەیە ئەمەوێت ئەم ساڵ لەتاقیکردنەوەی سەرانسەری دا بەشداری بکەم. وەرە باپێکەوە ژیان بەسەر بەرین.

نێرگس بەپێشنیارەکەم رازی بوو، ڕۆژی دواتر شتەکانی خستە ناو جانتایەك و هات بۆلام و دەست بەجێ بردمەوە بۆماڵەوە.

نێرگس زۆر خۆشحاڵبوو. وتی:

بێژەن ئێستە ئێمە زۆر بەختەوەرین تەنها خەم و پەژارەی رابردووە ئازارمان ئەدات. من هیچ کات ناتوانم روخساری خوشك و براکانم فەرامۆش بکەم.

بەپەلە قسەکەیم پێ بڕی و وتم نێرگس ئیتر بەسە باسی رابردو مەکە ئەوان فریشتەی بچوك بوون رەشەبای سەختی هەژاری بەرە و دەریای بێ بنی بردن، خونچەی نەکراوە بوون پایزی کوتوپڕ هەموویانی وەراند. ئەوان نەمامی بچوك بوون لافاوی ناوادە هەموویانی لەبن هەڵکێشا و لەگەڵ خۆیدا بردنی، هەرچەندیش بگرین بۆیان تازە ناگەڕێنەوە چاکتر وایە رابردوو فەرامۆش بکەین وەیان وابزانین رابردومان لەبیرچوەتەوە لەبەر ئەوە رابردوو هەرگیز ناگەڕێتەوە بەلام ئاینده هی خۆمانە پێویستە تەنها بیر لە ئاینده بکەینەوە بۆ ژیانی چاکتر هەوڵ بدەین.

لەم کاتەدا نێرگس بەئارامیەوە وەلامی دایەوە باشە بێژەن گیان ئیتر باسی رابردوو ناکەم.

لەو رۆژە بەدواوە ژورێکی گەورەم لەتەنیشت ژورەکەی خۆم گرت بەکرێ چەند مێز و کورسیەکم کڕی لەژورەکەماندا پۆلێکی دەرس خوێندنم کردەوە.

نزیکەی دە قوتابی لەپۆلەکەماندا خۆیان ناونوس کرد، ئەوکاتانەی بەتاڵ دەبووم دەرسم دەوتەوە، کاتەکانی ترم تەرخان کردبور بۆ دەرس خوێندن.

لەپاش ئەو رۆژە وازم هێنا لە نوسەری گەراجەکە.

ژیانمان رۆژ لەدوای رۆژ خۆشتر دەبوو، نێرگسیشم زۆر خۆش ئەویست ئەوکاتانەی دەرسم دەخوێند تا شەو درەنگان نەدەخەوت لە رۆژیشدا گشت کارەکانی ماڵەوەی ئەنجام ئەدا.

هەمان ساڵ بەشداریم کرد لە تاقیکردنەوەی سەران سەریدا لە رشتەی پزیشکیدا بەیەکەم دەرچووم ئەم سەرکەوتنەشم دەرگاکانی خۆشبەتی بەرومدا کردەوە.

من کە نەمدەوێرا لەبەر خەڵکی بە کوچە و کۆڵانەکاندا بڕۆم، ئەو رۆژانە زۆر بچوك بووم بچوکترین کلاو رۆژانەی تێدا نەبوو بەلام ئێستا دەرگاکانی خۆشبەختی یەك لەدوای یەك بەرومدا دەکرێنەوە.

کاتێك نێرگس زانی دەرچوم ئەویش لەخۆشیدا دەستی کرد بە دەرس خوێندن تا شەو درەنگانێك پێکەوەدەرسمان دەخوێند. عەسرانیش لەزانکۆ دەگەرامەوە خێرا دەستم دەکرد بە دەرس وتنەوە بە قوتابیەکانم.

قوتابیەکانم رۆژ لەدوای رۆژ لەزیاد بوندابوون، ژورێکی گەورەترم بەکریٚ گرت و قوتابیەکانم ژمارەیان بوو بە سی قوتابی. هەندیٚ جار بە قوتابیەکانم دەوت کلیلی گشت دەرگا داخراوەکان ئومێدە، مرۆڤی نائومێد مردوە.

لەبەر ئەوەی ئومێد واداری ژیانمان دەکات هەرگیز لە هەموو هەلومەرجێکدا لەهەموو نارەحەتیەکدا نابێت نائومێد بین. تەنها هەوڵی فێربوونی زانست بدەن لەبەر ئەوەی زانست مرۆڤ لە نالەبارترین قۆناغەوە بۆ بەرزترین قۆناغ دەبات.

قوتابیەکانم زۆریان خۆش دەویستم هەموو رۆژێك لەکاتی خۆیدا لە پۆلەکەیاندا ئامادە دەبوون زۆر بەباشی گویٚ یان لە قسەکانم دەگرت پاش ئەوەی دەرسەکەم تەواو دەکرد دەگەرامەوە بۆماڵەوە.

نێرگس زۆر میهرەبان و دڵسۆز بوو هەموو چاکیەکان لەودا کۆبوبونەوە هەڵسوکەوتی زۆر جیاوازتر بوو لە کچەکانی تر هەرگیز

حەزی لەشتی ناشیاو نەبوو. جل و بەرگی گران و زێڕ و زیوی بەلایەوە زۆر بێ نرخ بوو. تەنها دوو دەست جل و بەرگی هەبوو هەمیشە دەیشۆردن و لەبەری دەکردنەوە، هەرگیز نەیدەهێشت کراسی تری بۆربکڕم دەیگووت پێویستە پارەکانمان کۆبکەینەوە بۆئەوەی ژیانی خۆشتر بۆخۆمان دروست بکەین.

پاش حەوت ساڵ زانکۆم تەواوکرد لەبەر ئەوەی هەموو ساڵێك بەیەکەم دەرەچووم دەوڵەت ناردمی بۆ وڵاتانی ئەوروپایی بۆئەوەی دەرسی بەرزتر بخوێنم، لەبەر ئەوەی نەمدەتوانی خولەکێك بەبێ نێرگس بژیم پارەکانی خۆم و نێرگسیشم لەبانك دەرهێنا بۆئەوەی نێرگس لەگەڵ خۆم بەرم.

کاتێك سواری فڕۆکەبوین لەخۆمەوە کەوتمە بیرکردنەوە لە رابردوو، رابردوو وەکو پەردەیەکی سینەما لەبەرچاومدا تێپەڕ دەبوو بۆماوەیەکی کورت گەڕامەوە بۆ رابردوو. بۆ ئەو زەمانەی لەزیندان ئازادیان کردم لەکۆڵانەکاندا منداڵان بەبەرد و دارەوە شوێنم دەکەوتن و هاواریان دەکرد شێتە شێتە.

ئەوساتانەی بەبرسیەتی بەناو بازاڕدا دەڕۆیشتم هەموو خەڵکی لێم دوردەکەوتنەوە بەڵام ئێستا پاش ساڵانێك ئومێد و هەوڵ و کۆشش گەیاندمیان بەئارەزووەکانم بۆ سەرزەمینە دورەکان دەڕۆم، بۆئەوەی لەگەڕانەوەمدا لەو ڕێگا دورەوە بتوانم یارمەتی هاوشێوەکانم بدەم یارمەتی ئەو کەسانەی لە رۆژانی بەتبەختیدا دەریان دەکردم.

لەناو بیرکردنەوەدا بووم لەناکاو نێرگس بەخۆشحاڵیەوە وتی بێژەن باوەڕناکەم بەو ئەندازەیە کامەران بوبین تەنانەت لە خەیاڵیشمدا نەبوو

هەرگیز بیر لە وڵاتانی دەرەوە بکەمەوە چون ئارەزوویەکی مەحاڵ بوو لەوەڵامدا وتم: پێویستە لەوەش زیاتری مەران ببین.

من و نێرگس بۆتەواوکردنی خوێندن رۆیشتین بۆ ئینگلیز، چون نێرگس پێشتر لەماڵی ئینگلیزێکدا کاری دەکرد تارادەیەك ئینگلیزی دەزانی، ئەو نمونەی ئافرەتێکی میهرەبان و دڵسۆز و فیداکار بوو، هەرگیز کاری ناشیاوی نەدەکرد لەهەموو شوێنێکدا وەکو سێبەر بەدوامەوەبوو.

وەکو ئافرەتانی تر بەدوای مۆدێل و جل و بەرگی گران بەهادا نەدەگەڕا، هەردوکمان پێکەوە کامەران و بەختەوەر بووین بەڵام هەندێ جا نێرگس بێتاقەتی دایك و خوشك و براکانی دەبوو دەیگوت بێژەن ئاخر دەبێت لەبەرچی کەس و کارم لەدەست بدەم؟ نەدەبوا بمرن، سروشت تەنها ستەمی لەوان کرد زۆر بێ بەزەییانە لەناوی بردن.

بەڵام من هەمیشە پێم دەگووت نێرگس لەبەرامبەر چارەنوسدا دەبێت دەست بەدەمتەوە بگریت و هیچ قسەیەك نەکەیت لەبەر ئەوەی هیچ هێزێك نیە بەرەنگاری چارەنوس بێتەوە، پێویستە وەکو خەڵکی لەبەرامبەر جارەنوس دا ئارام بگریت و بێدەنگ ببیت، تا ئەندازەیەك بەقسەکانم رازی دەبوو.

بەوشێوەیەی کەوتم شە و رۆژ نێرگس ئینگلیزی دەخوێند منیش هەر بەردەوام بووم لە خوێندنەکەم. رشتەی خوێندنەکەم لەبەشی چا و لوت و گوێدا بوو.

پاش چەند ساڵێك پۆلەکانی زانکۆم تەواو کرد بەخۆشحاڵیەکی زۆرەوە لەگەڵ نێرگس دا گەڕاینەوە بۆ وڵاتەکەی خۆمان، پاش چەند مانگێك لە نەخۆشخانەیەکدا دامەزراین لەبەر ئەوەی بڕێك پارەشم پێ

مابویەوە کلینیکێکی بچوکیشم دانا و لە عەسراندا سەرگەرمی کار بووم تێیدا، هەمیشە ویژدان و مرۆڤایەتیم لەبەرچاو بوو، هیچ کات رابردووی خۆمم لەبیر نەدەچووەوە.

رۆژگارێـك برسـی و سـەرگەردان بـووم ئێـستا دەمـەوێت ببمـە پەناگەیەکی چاك بۆ مرۆڤە سەرگەردان و بێ چارەکان.

شەو و رۆژ کارم دەکرد زۆر بەدڵسۆزیەوە سەرم دەدا لەنەخۆشەکان ئەوانەی پێویستیان بەیارمەتی دەبوو یارمەتیم دەدان.

هێـدی هێـدی ناوبـانگم لەشـارەدا دەرکـرد ئـەو شـارەی رۆژانێـك لەمەوپێش بە شێت و نەفامیان دەزانیم و بەقسەی ناشیرین دەریـان دەکردم، ئەوشارەی پەنایەکی نەبوو تێیدا بحەوێمەوە و بەناچاری لە کولانـەی سـەگەکاندا دەخـەوتم و خـۆراکی ئـەوانم دەخـوارد، ئێـستا بەوپەڕی دڵسۆزیەوە خزمەتیان دەکەم.

خـەڵکی بانگیـان دەکـردم دکتـۆر بێـژەن، دەشـیان زانـی نێـرگس دەستگیرانمە، نێرگس زۆر جوان بووبوو زمانی ئینگلیزیشی بەباشی دەزانی و لەزۆربەی کارەکاندا یارمەتی دەدام.

لەو رۆژە بەدواوە کامەران بووم نێرگس کەلەگەڵمدا بوو ئەوەندەی تر خۆشـحاڵی کردبـووم، هێـشتا لەوژیانـە سادەیەشـدا نێـرگس هـەر بەسادەیی دەژیا و خۆی لێ نەگۆڕابوو.

رۆژێکـی پـشو دەمـەو عەسـر نێـرگس وتـی بێـژەن ئـەمڕۆ ئاسمـان خۆرەتاوێکی خۆشە بابڕۆین بۆ سینەما.

پێم ووت باشە دەی زوکە بابڕۆین.

سەری شـانە کـرد، منـیش پێڵاوەکـانم بۆیـاخ کـرد، نێـرگس لەبـەر ئاوێنەدا قژە لولەکەی بەئارامی شانە دەکرد، وتم نێرگس پاش ئەوەی

بڕێکی باش پارەمان پاشەکەوت کرد خانویەکی بچوکی لێ دەکڕین و زەماوەند دەکەین.

ئەو لەوەڵامدا بەپێکەنینەوە وتی بێژەن تۆ لەهەموو شوێنێکدا بە دەستگیرانی خۆت بانگت کردووم بەڵام لەمەودوا بە خوشکە بانگم بکە.

خێرا وتم بۆچی مەگەر چی بوە وا ئەم قسەیە دەکەیت؟

بەنەرمیەکەوە وەڵامی دایەوە بێژەن من لەوە و پێش هیچم نەدەگوت چون بەئارەزوی خۆم رازی بووم بەوەی شوت پێ بکەم بەڵام ئێستا وانیە چون تۆ دکتۆریت و منیش کچێکی سادە و ساکار. ئێستا جوانترین و سەرمایە دارترین کچانی ئەم شارە خوازیارن شوت پێبکەن پێویستە یەکێك لەوانە هەڵبژێریت، حەزناکەم ببم بە رێگر لەبەرامبەر کامەرانی ژیانتدا، لەگەڵ کەسێکدا زەماوەند بکە هاوشانی خۆت بێت شیاوی خۆت بێت نەك من کچێکی سادە و ساکار و هەژار.

بەپەلە وەڵامم دایەوە نێرگس هەرگیز قسەی وامەکە نامەوێت ئیتر گوێم لەوجۆرە قسانەبێت مەگەر لەوە و پێش من چ کەسێك بووم؟ تۆ رابردوی من باش دەزانیت چاکتر وایە هیچ نەڵێیت من نازانم مەگەر تۆ لەچیت کەمە بەبۆچونی من تۆ لەهەموو ئەوانەی باست کرد بەرزتر و دڵسۆزتریت، ئەو چاکە خوازیەی لەتۆدایە لەهیچ کچێکی تردا نایبینم، ئێمە لەمەودوا خاوەنی خۆمان نین ئێمە موڵکی کۆمەڵگا و ئەو خەڵکە داماوەین پێویستە ئامانجمان ئەوەبێت خزمەت بکەین بە هاوشێوەکانی خۆمان.

پێم وایە ئەوکچەی بەدوای مۆدیل دا بگەڕێت و هەمیشە بەدوای خۆش بەختی خۆیەوەبێت ناتوانێت خزمەت بەخەڵکی بکات، بەڵام نێرگس تەنها تۆ شیاوی ئەوشوێنەیت چونکە لەکاتی منداڵیتدا زۆر

لەرادەبەدەر لەناو ئازار و زەحمەتدا بویت، لە هەمووکەس زیاتر دەردی کۆمەڵگا دەزانیت. بەتەنها تۆم خۆش دەویت تۆی تابلۆی خۆش گوزەرانی من هیچ کچێك پلە و پایەی تۆی نیە لەبەرچاوم دا.

پاشان دەستمی گرت و پێکەوە بەرەو سینەما رۆیشتین.

لەوکاتەدا لەناکاو لەژێر قادرمەکاندا پیاوێك هاواری کرد دکتۆر فریام بکەوە کچەکەم خەریکە دەمرێت ئەگەر زوو فریام نەکەویت دەمرێت.

خێرا بە نێرگسم ووت بڕۆرە ژورەوە ئەمشەو ناتوانین بڕۆین بۆ سینەما، پاشان بەپەلە پێداویستیەکانم هەڵگرت و چومە خوارەوە، شتێکی زۆر سەرسامم بینی جەنابی قازی بوو بە روخسارێکی ئاڵۆز و چاوی پڕ فرمێسکەوە راوەستاوە و هاوار دەکات دکتۆر فریام کەوە.

چومە پێشەوە و وتم جەنابی قازی چی رویداوە؟

بەبیستنی قسەکەم سەری بەرز کردەوە و روانی پێمدا و ساتێك بێدەنگ بوو نە من هیچم ووت و نە ئەویش.

پاشان بەڕوخسارێکی داماو و سەرسامیەوە وتی ئۆ دکتۆر گیان تۆ هەمان بێژەنەکەی ماڵی خۆمانی باوەڕ ناکەم ئایا راستە هەمان بێژەنیت؟

وەڵامم دایەوە بەڵێ جەنابی قازی باشت ناسیمەوە هەمان بێژەنم ئێستا دەفەرمویت چی؟

لەکاتێکدا زۆر نارەحەت بوو دەستە لەرزۆکەکانی هێنایە پێشەوە و وتی ئێستا کاتی ئەوە هاتوە تۆڵەم لێ بکەیتەوە بەڵام دکتۆر گیان تکادەکەم تۆڵە بەکار مەهێنە لەبەر ئەوەی کچە تاقانەکەم لەدەست

دەردەچێت لەپاش کچەکەم ژیانم ناوێت. دکتۆر من خراپم کرد تۆ لەگەڵم خراپ مەبە.

ئێستاکەسێکی داماو و بێ دەسەلاتم پێویستم بەلێبوردەیی تۆیە.

خێرا وەلامم دایەوە جەنابی قازی وشەی تۆڵە ناناسم نازانم مانای ئەو وشەیە چییە، لەبەر ئەوەی گوێچکەم خوی بەو وشەوە نەگرتوە، تۆڵە بۆلەناو بردنی مرۆڤایەتی یە، جەنابی قازی تاکاتێك گیانی لێبوردەیی هەبێت بۆ بەدوای تۆڵەدا بگەڕێین. بابڕۆین چونکە ئێستا من خاوەنی خۆم نیم تا بمەوێت تۆڵەت لێ بکەمەوە، ئێستا من موڵکی خەڵك و کۆمەڵگام گەر تۆ خراپەت لەگەڵ کردبم تاوانی کچەکەت چی یە تا تۆڵەی لێ بکەمەوە.

جەنابی قازی دکتۆر پێش هەموو شتێك ئەبێت مرۆڤ بێت لەبەر ئەوەی ئەرکی پزیشکی وائەخوازێت فریای خەڵکی بکەویت گەر بیەوێت تۆڵە بەکاربهێنێت بەرامبەر بە نەخۆشێك ئەو دکتۆرە پیاو کوژە.

جەنابی قازی من پیاو کوژ نیم مرۆڤێکم ئەمەوێت خزمەتی مرۆڤایەتی بکەم بەلامەوە دۆست و دوژمن جیاوازیان نیە گەر خزمەتێکم پێ بکرێت لەگەڵ دۆستەکانمدا بەهەمان شێوەش لەگەڵ ناحەزەکانمدا ئەو خزمەتە هەر دەکەم.ئێستاش بۆچارەسەری کچەکەت هەرچیم لەتوانادا بێت دەیخەمە گەڕ جەنابی قازی بهێڵە رون و ئاشکراو بێ پەردە پێت بڵێم ئەوا منیش تۆڵەم لێکردیتەوە تۆڵەی کارە خراپەکانت بۆئەوەیە کەمێك ئاوڕ لە رابردوت بدەیتەوە و دەست لە خراپەکاری و بێویژدانی هەڵبگریت ئەو ویژدانەی ساتێك ناهێڵێت ئارام

بگریت. واتە منیش تۆڵەی حەقت لێ بکەمەوە بەڵام ئایا ئەو تۆڵەیە مرۆڤانەیە و لەجێی خۆیدایە؟

پاشان بە ئوتۆمبیلەکەی چوینەماڵەوە کاتێك پێم نایە ناو ماڵەکەوە وا هەستم دەکرد هەرگیز ناتوانم بچمە ژورەوە لەبەر ئەوەی ئەوەندە ئازار و ئەشکەنجەم لەوماڵەدا بینیوە قاچەکانم بەگوێیان نەدەکردم.

هەرچۆنێك بوو چوینە ژورەوە لەگەڵ جەنابی قازیدا چوینە ژوری کچەکە، لەگۆشەیەکی ژورەکەدا کچێکی زۆر جوان بەڕوخسارێکی زەرد و ژاکاوەوە لەسەر خۆ چوە، ژنێکی سەرسپیش لەپاڵ قەرەوێڵەکەدا دەگریا. کاتێك کەچومەپێشەوە و جوان سەیرم کرد یەکسەر ناسیمەوە ژنی جەنابی قازی بوو لەماوەی ئەو چەندساڵەدا تەواو پیر بوە و پەکی کەوتوە، کاتێك منی بینی وتی:

جەنابی دکتۆر یارمەتیمان بدە کچەکەم زۆر نەخۆشە، کەمێك سەیری کردم، بەڵام نەیناسیمەوە.

وتم خانم بەبێ زەحمەت بڕۆرە دەرەوە، پاش پشکنینی چڕ و پڕ سەرنجمدا غودەیەك لە قوڕگیدایە و ئەبێت بەپەلە نەشتەرگەری بۆ بکرێت، لەسەدا نەوەد ترسی مردنیشی لێدەکرێت،

ئەگەر نەشتەرگەریەکە سەرکەوت ئەوا هیچ، خۆ ئەگەر سەرکەوتو نەبووم ئەوا جەنابی قازی وادەزانێت تۆڵەم لێکردەوەتەوە.

خێرا دەستم کرد بە نەشتەرگەری، نەشتەرگەریەکە نزیکەی دوو کاتژمێری خایاند و لەو ماوەیەدا هەموو کۆششێکی خۆمم کرد و سەرکەوت و بووم. جەنابی قازیم بانگ کردە ژورەوە و وتم فەرموو جەنابەی قازی کچەکەتان هۆشی هاتوەتەوە و زۆرباشە بەڵام پێویستە ئاگاتان لێی بێت.

بەپەلە هاتە پێشەوە و دەستی ماچ کردم.

بەپەلە وتم: دەستم بۆ ماچ دەکەیت من ئەرکی خۆمم بەکارهێناوە.

لەکاتێکدا ئەشکی شادی بەچاویدا دەهاتە خوارەوە پێی وتم:

جەنابی دکتۆر دەرسی مرۆڤایەتیت فێرکردم، من قازی ئەم شارەبووم تا پێم کرا بەرەوم بە زوڵم و ستەم دەدا لەکاتێکدا نەمدەزانی چ ئەرکێکی گەورە و دژوارم لەسەرشانە بەلام تۆ بەئاگات هێنامەوە،جەنابی دکتۆر بەئاگات هێنامەوە ئێستا مانای مرۆڤایەتی چاك تێدەگەم، ئێستا کە کچەکەمت لە مەرگ رزگار کرد دەمەوێت وەکو کەنیزەکێك پێشکەشتی بکەم و سەروەت و سامانەکەمت پێ بدەم بۆئەوەی بەکامەرانی بژیت. کچەکەشم خوێندەوار و جوانیشە، چەندساڵێکیش لەو ولاتە ئەوروپیانە بوە ئەمساڵ تازە گەڕاوەتەوە لێرەدا دوچاری ئەم نەخۆشیەبوو بۆلای هەر دکتۆرێکم دەبرد دەیگوت:

من ناتوانم چارەسەری بکەم تەنها دکتۆر بیژەن دەتوانێت چارەسەری بکات منیش هاتم بۆلات، بەڕاستی سەلماندت مرۆڤێکی تەواویت ئێستاش کچەکەم بۆتۆ.

وتم جەنابی قازی دەستگیران دارم دەستگیرانەکەشم نێرگس ە بەداخەوە ناتوانم کچەکەت بهێنم.

جەنابی قازی وتی: لەگەڵ کچەکەی مندا هاوسەر گیری ناکەیت بەڵێنت پێدەدەم هاوسەرێکی دڵسۆز و میهرەبان بێت بۆت.

لەوەلامدا وتم:ئاخر جەنابی قازی دەستگیراندارم جگە لەویش کەسی ترم ناوێت.

جەنابی قازی کەمێك بیری لێکردەوە و وتی: دکتۆر کەناتەوێت کچەکەم بێتە هاوسەرت گرنگ نیە خانویەکی گەورەم لەنزیکی

گۆرەپانی گەورەی شاردا هەیە بەکرێم داوە دەیبەخشم بەتۆ و بیکە بە نەخۆشخانەیەکی گەورە گەرچی ئەم هەدیەشم شیاوی تۆی بەڕێز نیە.

بەخۆشحاڵیەوە وتم زۆر سوپاستت دەکەم ئەم هەڵوێستەت جێگای ڕێز و سوپاستە.

بەپەلە وتی جەنابی دکتۆر بەڕاستی منت گۆڕی وانەزانم جگە لەم دونیایە دونیایەکی گەورە تر هەبێت. پاشان خواحافیزیم کرد و هاتمەوە بۆماڵەوە.

ڕۆژی دواتر بەیانی دیسانەوە چومەوە بۆماڵی قازی ڕاستەوخۆ بۆسەر قەرەوێڵەی کچەکەی بۆئەوەی بزانم حاڵی چۆنە پاش ئەوەی زانیم حاڵی باشە لەگەڵ جەنابی قازیدا ڕۆیشتین بۆ ئەوماڵەی بڕیاری داوە بیدات بەمن و بیکەین بە خەنۆشخانە.

کاتێك چوینە ژورەوە هەستم کرد ئەم ماڵە نامۆ نیە پێم. کەمێك سەیری دەوروبەرم کرد ڕاستەوخۆ چاوم بەپەیکەرەکە کەوت کە دوفریشتەکەی بەسەرشانەوەبوو، بەڵێ ناسیمەوە. لەخۆمەوە هاوارم کرد.

جەنابی قازی یەکسەر دەستی گرتم وتی چی بوە دکتۆرگیان؟

زۆر بەغەمباریەوە وتم جەنابی قازی جوان لەبیرت دێت چەندساڵێك لەمەوبەر دزێکت لێرەدا کوشت؟

بەسەرسامیەوە وتی بەڵێ هەموشتێکی ئەوشەوەم بیردێت. چەندساڵێك لەمەوبەر ئەم ماڵەم دابوو بەکرێ بەیەکێك لە هاوڕێکانم، ئەوەبوو شەوێکیان سفرەی قوماری ڕازاندبووەوە، ئێمەش لە نیوەڕۆوە تا نیوەی شەو خەریکی قومار بوین، لەبەر ئەوەی لەنیوەی شەو تێپەڕی بوو هەر لەوێ مامەوە هێشتا خەوم لێنەکەوت بوو سەرنجمدا لە

راپەوەکە تەپە تەپێك دێت بەپەلە خۆم گەیاندە راپەوەکە پاشان بینیم دزێك لە ژورەوەیە و خەریکی دزینی شتەکانی ژورەوەیە، گەڕامەوە بۆ سەرجێگەکەی خۆم و دەمانچەکەی خۆمم هەڵگرت، لەڕاپەوەکە بە دزەکە گەیشتم بەفیشەکێك کوشتم بەڵام ئەوەی بەلای منەوە گرنگە تۆ چۆن زانیت؟

وتم ئاخر ئەودزە هاوڕێم بوو، زۆر بێ رەحمانە کوشتت ئێستاش خوێنی ئەوکوڕە بێ تاوانە لە راپەوەکەدا دەبینم، ئێستاش گوێم لە هاوارەکانیەتی ئەو دەیویست بەو دزیە پێنج سەد تمەن پارەی دەست کەوێت و بیدات بە دکتۆر بۆچاوی دایکی، زۆر داماو بوو بێ رەحمانە کوشتت.

جەنابی قازی تۆ بۆ رزگارکردنی کچەکەت چەندناڕەحەت بویت لەوساتانەداهەرچیت پێ بکرایە دەتکرد، ئەویش لەبەر چاوی دایکی ئەوکارەی کرد تۆش کوشتت سەیری دەستەکانت بکە ئێستاش خوێناویە.

جەنابی قازی بەقسەکانم دەستی کرد بەگریان، منیش پرمەی گریان گرتمی، روخساری حەسەنم دەکەوتەوە بەرچاو. روخسارە رەنجاوەکەی ساتێك لەبەرچاوم ون نەدەبوو. لەبەر ئەوە خۆم پێ رانەگیرا لەوێدا بمێنمەوە لەگەڵ جەنابی قازیدا هاتینە دەرەوە.

پاش مانگێك ئەو ماڵە گەورەیەم کرد بەنەخۆشخانە و بەیادی حەسەنەوە ناوم نا نەخۆشخانەی حەسەنی داودی. هەر گۆشەیەکی ئەو نەخۆشخانە یادەوەریەکانی حەسەنی دەهێنایەوە پێش چاوم، نێرگس سەرپەرشتی نەخۆشخانەکەی گرتە ئەستۆ و منیش بوم بەسەرۆکی نەخۆشخانەکە.

لەپشتماڵەکەوە فەرمانم دا خانویەکی بچوك بۆ من و نێرگس دروست بکەن بۆئەوەی زەماوەند بکەین و بڕۆینەماڵی خۆمانەوە.

رۆژان یەك لەدوای یەك تێدەپەڕین، شەوێکیان لەگەڵ نێرگس دا بووم لەگۆڕەپانی شاردا دەگەڕاین لەناکاو چاوم بەپیاوێك کەوت زۆر لەباوکم دەچوو، بینینی ئەو پیاوە بەتەواوی ناڕەحەتی کردم و وتم:

نێرگس حەزدەکەم جارێکی تر باوکم ببینمەوە، ئاخر من باوکم هەیە گەرچی ئەو لە سیانزەساڵیدا دەری کردم و بێ بەخت و تەنهای کردم کەچی هەر حەزدەکەم بیبینمەوە. نازانم ماوە یان نە، بەیانی دەڕۆمەوە بۆ شارەکەی خۆم بۆئەوەی باوکم و زادگاکەشم ببینمەوە، لەدو رۆژ زیاتریشم پێ ناچێت، تۆش گەر حەزدەکەیت وەرە لەگەڵم بەڵام چاکتروایە بەتەنها خۆم بڕۆم.

نێرگس بەپێشنیارەکەم رازی بوو.

بەو ئۆتۆمبیلەی جەنابی قازی لەگەڵ ماڵەکەیدا پێیبەخشی بووم بەرەو شارەکەی خۆم کەوتمە ڕێ. بە شەو و رۆژێك گەیشتمە شارەکەی خۆم. کوچەو کۆڵانەکانم نەدەناسیەوە، ماڵەکان زۆر گۆڕابوون، خەڵکی شارەکە هەمویان نامۆبون لەلام، خۆشم لەشارەکەدا بەنامۆ دەزانی، زۆر بەناڕەحەتی ماڵەکەی خۆمانم دۆزیەوە. ماڵەکەشمان زۆر گۆڕابوو جۆگەکەی بەردەممان ووشکی کردبوو، دوو ریزە درەختی قەراغ جۆکەکەش شوێنەواریشی نەمابوو.

بەئارامی لەدەرگاکەم دا، دڵم تەپە تەپی دەکرد، بیرم لەوە دەکردەوە گەر باوکم و باوەژنەکەم بمبینن چی دەڵێن. ئایا بەبینینم خۆشحاڵ دەبن یان بون و نەبونی من بەلایانەوە هەر گرنگ نی یە. ئایا پاش ساڵانێکی دور بە روخسارێکی جوانەوە بەخێرهاتنم لێدەکەن وەیان

ساردو سڕدەبن لەگەڵم، لەوانەشە باوکم لەوماوەیەدا مردبێت کێ ئەزانێ ڕەنگــە هیــچیش ڕوی نــەدابێ، بــاوکم و باوەژنەکــەم پێکــەوە خــۆش گوزەرانن، دڵم تەپە تەپی دەکرد نەمدەتوانی خۆم کۆنترۆڵ بکەم، حەزم دەکرد دەرگاکە زوو بکرێتەوە.

پاش چەند خولەکێك دەرگاکە کرایەوە ژنێکی جوان لەدەرگاکەدا ڕاوەستابوو بەئارامیەکەوە وتی:

برا ئیشت چی یە؟

وتم خانم گیان کارم بەخاوەنی ئەم ماڵەیە.

بەپەلە وتی وتت چی؟ من خاوەنی ئەم ماڵەم.

بە ناڕەحەتیەکەوە وتم داوای لێبوردن دەکەم من ئیشم بەتۆ نیە ئیشم بەخاوەنە ئەسڵیەکەی ئەم ماڵەیە.

ساتێك بیری لێ کردەوە و پاشان وتی بەڵێ لەمەبەستت تێگەیشتم خاوەنی ئەسڵی ئەم ماڵە دەساڵ لەمەوپێش فرۆشتی بەئێمە ئێستاش خۆی گرفتارە، لەشەقام و کۆڵانەکاندا گەدایی دەکات، زۆر سەرگەردان و داماوە، لەکۆتایی ئەم شەقامەدا کەلاوەیەکی بۆخۆی دروست کردوە شــەوانە لــەوێ دا دەخــەوێت. لــەئێوارەدا ئــەتوانی بیبینــی، پاشــان خواحافیزی کرد و دەرگاکەی داخست.

چەند ساتێك لەوێدا ڕاوەستام سەیری ماڵەکەم دەکرد، کاتێك ئێوارە داهات هێدی هێدی کەوتمە ڕێ، ئەو کەلاوەی ژنەکە پیشانی دام ڕاستی کرد کەوتبوە کۆتایی شەقامەکەوە. سەیرێکی کەلاوەکەم کرد کەسیش لەدەوروبەرمدا نەبوو دونیا تاریك بوو بەرەو کەلاوەکە ڕۆیشتم بۆئەوەی باوکم ڕزگار بکەم لەو بەتبەختیە.

ئەو باوکەی لەشەوێکی سارد و سڕی زستاندا دەری کردم و دەرگاکەی لێ داخستم لەکاتێکیشدا دەیزانی جگە لەو هیچ کەسی تر شك نابەم. تەنیام. تەنیاو بێ کەس و بێ سەرپەرشت، گوێی نەدایە قوڵپەی گریانەکانم و بەزەیشی پێمدا نەهاتەوە، ئێستاش بەقاچی خۆم بەرەو لای ئەو دەڕۆم لەکاتێکدا دەشم توانی بگەڕێمەوە و شاوڕی لێ نەدەمەوە و لەبیری خۆشمی بەرمەوە، بەڵام لەپێش هەموشتێکەوە مرۆڤ بووم مرۆڤایەتیەکەم پاڵی پێوە دەنام بەرەو پێشەوە بڕۆم.

قاچەکانم بۆ هەڵنەدەهات، وەك بڵێی بەقاچی خۆم بۆ پەتی سێدارە بڕۆم وەهابوو. بە هەرزەحمەتێك بو بەرەو پێش رۆیشتم و گەیشتمە دەرگای کەلاوەکە، چەند ساتێك لەدەرەوەی کەلاوەکە راوەستام و پاشان بەئارامیەکەوە دەرگای کەلاوەکەم کردەوە و رۆیشتمە ژورەوە.

زۆر تاریك بوو چاوم چاوی نەدەبینی، لەو تاریکیەدا دەنگێکم بیست پرسیاری کرد کێیت؟

دەنگەکەم بەباشی ناسیەوە دەنگی باوکم بوو، بەڵێ دەنگی باوکم.

وەڵامم دایەوە خۆمانین، بەڵام وەڵامی ترم نەبیست، لەوتاریکیەدا بەردەوام بەدوای باوکمدا دەگەڕام، ئەو باوکەی شەو و رۆژ لەگەڵیدابوم و خۆشم دەویست، بەڵام ئەو تەنانەت هەواڵیشی نەدەپرسیم، ئەو کەسەی بەرق و کینەوە لەناو ئەو بەفرەدا دەرگای بەڕومدا داخست.

بەدەنگێکی لەرزۆکەوە وتم:

باوکەگیان تەنها هەر ئەم شەو دەرگاکەم لێ بکەرەوە لەم سەرما ساردەدا ئەم شەو رەق دەبمەوە، هاوارم کردباوکەگیان فریام بکەوە جگە لەتۆ کەسی ترم نیە، باوکەگیان دەرم مەکە با نەمرم بەزەیت بێتەوە پێمدا جگە لەتۆ کەسی ترم نیە، ئەویش لەوەڵامدا دەیگوت:

بێدەنگ بە دەرگاکەی لێداخستم و ڕۆیشت بۆلای هاوسەرەکەی و بەتەواوی فەرامۆشی کردم، ڕەنگە لەوماوە دوورودرێژەدا بەبیری نەهاتبێتەوەکوڕێکی هەبوە، منی خستە ژێر پێی ژنەکەیەوە و ئێستاش من بەرەو لای گەڕاوەمەتەوە لەبەر ئەوەی خوێنەکانمان تێکەڵاوە و لەو پەیدا بووم حەزناکەم بەدبەختی و بێدەسەڵاتی ئەو ببینم.

گەرچی لەوشەوە ساردەدا دەری کردم و سۆزی باوکایەتی لەلانەمابوو. لەوکاتەدا باوکم دیسانەوە پرسی: کێی؟

وەڵامم دایەوە ڕێبوارێکم دەمەوێت ئەم شەو میوانی تۆبم.

لەکەلاوەکەیدا جگە لە گۆچانێك و تورەکەیەکی وردە نان هیچی ترم نەبینی، لەو تاریکی و بێدەنگیەدا باوکم بەداماویەکەوە دانیشتبو، بەهۆی تاریکیەکەوە روخساریم نەدەبینی، حەزیشم دەکرد روخساری ببینم لەبەر ئەوەش پرسیارم لێکرد:

لەم تاریکیەدا بێزار نابیت؟

ئەویش پرسیاری کرد: مەبەستت لە تاریکی چی یە؟

بەدەنگێکی بەرز وتم مەبەستم تاریکی شەوە.

بەئارامیەکەوە وتی: نەخێر خۆمن هەستی پێ ناکەم.

لێم پرسی: چۆن تۆ هەست بەم تاریکیە ناکەیت؟

وتی لەبەرئەوەی تاریکی دونیای من تاریکترە لە شەو، ڕۆژی روناك و تاریکە شەو بەلای منەوە هیچ جیاوازیەکیان نیە، نە هەست بە تاریکی شەو دەکەم و نەبە روناکی خۆر، لەبەر ئەوەی من کوێرم. من خۆم دونیام لێ تاریك بور چۆن هەست بە تاریکی شەو دەکەم، نازانم کەی شەو دەبێت و کەی ڕۆژیش دەبێتەوە. بەلای منەوە دونیا هەر شەوە، شەوێکی دورودرێژ هەرگیز ڕۆژ نابێتەوە ئەو دەمەی ڕۆژ

دەبێتەوە بە دەنگە دەنگی دەرەوەی کەلاوەکەدا دەزانم ڕۆژ بوەتەوە هەست دەکەم خۆر بەئاسمانەوەیە بەڵام من لێی بێ بەشم و دونیا هەر تاریکە بەلامەوە، لەجیهانی تاریکیدا بچوکترین کلاوڕۆژنەی روناکی هەست پێناکەم، دەنگی شەلالەکان و لق و پۆپی درەختەکان هەست پێ دەکەم بەڵام لەبینینیان بێ بەشم، هەموو دەرد و ئازارێك کۆتای پێ دێت هەموو ئەشکەنجە و ناڕەحەتیەك کۆتایی پێ دێت، شادی و خۆشی جێی دەگرێتەوە، بەڵام ئەم دونیا تاریکەی من هەرگیز رون نابێتەوە.

بەهێواشی وتم:

نیگەران مەبە من دکتۆرم ئەتوانم چاوەکانت چاك بکەمەوە.

بەپەلە وتی: تۆ دکتۆریت من ناتوانم بتبینم وەرە پێشترەوە، وەرە پێشەوە، لەلامەوە دابنیشە نازانم لەکوێدایت تەنها دەنگت دەبیسم حەزدەکەم لەتەنیشتمەوە دابنیشیت، حەزدەکەم لەنزیکەوە قسەت لەگەڵ بکەم، وەرە پێشترەوە تۆ فریشتەی دەمەوێت ئەوەی لەدڵمدایە پێت بڵێم.

وتم لەنزیکتەوەم هەرچی حەزدەکەیت بیڵێ.

بەپەلە وتی: نا زۆر لێمەوە دوری بەچاکی هەستەکەم بەدەنگەکەت دورە لێمەوە وەك لە چاڵێکی قوڵدابم و تۆش لەسەرەوە راوەستابیت حەزدەکەم نزیك ببیتەوە زۆر نزیك جەنابی دکتۆر مەترسە وەرە پێشەوە.

باوکێك ڕۆژێك لەماڵەکەی دەری کردم هەرچەندە دەیزانی پێویستم بەسۆز و بەزەی و دڵ ئەوایی ئەو هەیە، منی بەبێ رەحمانە لەماڵ دەرکرد تەنها لەبەر ژنێك ئێستا چاوەڕوانە نزیك ببمەوە لێی نزیکتر لەلایەوە دابنیشم کەچی بەبیری ناکەوێتەوە ڕۆژێك دڵە مندالەکەمی

شکاند و بەگریانەوە دەری دەکردم،ئێستا پێم دەڵێت وەرە پێشترەوە مەترسە وەرە تا ئەوەی لەدڵمدایە بۆتی هەڵڕێژم. وەك بەبیری نەبێت رۆژگارێك منیش بەرەو لای ئەو ئەڕۆیشتم و دەپاڕامەوە بەگریان و نائومێدیەوە پێم دەوت:

باوکە گوێ لەقسەکانم بگرە بهێڵە ئەوەی لەدڵمدایە بۆتی باس بکەم، باوکە مەهێڵە بمرم با ئەوەی لەدڵمدایە پێتی بڵێم بهێڵە راستیەکانت بۆ رون بکەمەوە، کەچی لەوەڵامدا دەی گوت:

راستیم ناوێت دوربکەوەرەوە لێم هەرگیز نەت بینمەوە، پێویست ناکات گوێم لە قسەتەوە بێت، گوێ بۆ قسەی تۆ هەرگیز ناگرم.

بەلام ئێستا من ئەو رەفتارەی لەگەڵ ناکەم و بەپەلە چومە لای باوکمەوە و لەتەنیشتیەوە دانیشتم، دەستی درێژ کرد و دەستی گرتم و وتی:

دکتۆر یارمەتیم بدە و لەم جیهانە تاریکە رزگارم بکە، دکتۆر نازانیت چەند ناخۆشە بۆ مرۆڤێك شەو و رۆژی هەر تاریکبێت، نە دەتوانێت شوێنێك ببینێت، تۆ نازانیت ئەم دونیایە چەند تاریکە، دکتۆر نازانیت ئەم تاریکیە چەند کوشندەیە و بەدەست ئەم تاریکیەوە ساڵانێکە مردوم سەیرم بکە چەند لاواز و داماوم بەدەست ئەم تاریکیەوە دڵ و گیانم لەدەست چوە، تۆ نازانیت چەند ناخۆشە مرۆڤێك دڵ و گیانی لەدەست دابێت دکتۆر تکات لێدەکەم تۆزێك چاوەکانت بنوقێنە و بزانە هەموشوێنێك تاریك نیە و دڵت ژان ناکات.

بەلام من شەو رۆژ ساڵ و مانگ بەدەست ئەو تاریکیەوە دەتلێمەوە بزانە لەناو چ ئازارێکدام دکتۆر ئازار هەیە لەوە کوشندەتربێت؟ تاریکی مرۆڤ دەکوژێت، دکتۆر من مردوی بەشی زیندوخۆرم، تۆ دەتەوێت

دوباره ژیانم پێ ببەخشیتەوە، من پەیکەرێکی سەرگەردانم و بەدوای رۆحی ون بومدا دەگەرێم. ئایا بەراستی دەتەوێت رۆح و دڵم پێ بدەیتەوە؟ ئایا بەراستی دەتەوێت دەستم بگریت و لەم تاریکیە بەرەو دونیای روناکم بەریت؟! دکتۆر رزگارم بکە گەر رزگارم نەکەیت دەمرم لەکاتێکدا خوازیارم جارێکی تر خۆر و مانگ و ئەستێرەکان ببینمەوە، ئەم تاریکیە دەمکوژێت لەکاتێکدا شەو و رۆژ بەو ئومێدەوە دەژیم جارێکی تر روناکی ببینمەوە ئاسمانەکەی سەر سەرم ببینمەوە، کێوەکانی دەوروبەری شارەکەم ببینمەوە.

دکتۆر تەنها تۆ دەتوانی لەم تاریکیە رزگارم بکەیت گەرچی ناتبینم و نات ناسم و ناشزانم لەبەرچی هاتوی بۆ ئەم کەلاوەیە بەلام وامهەستەکەم فریشتەبیت لەئاسمانەوە باریبیت بۆسەر زەوی و رزگارم بکەیت.

وتم پێم بڵێ بزانم چۆن کوێر بویت؟

دەستەکانی گوشی و وتی: هەموشتێکت بۆباس دەکەم لەبەر ئەوەیش راستیەکانت پێ بڵێم دەبێت بگەرێمەوە بۆرابردوو بۆئەوکاتەی بیست ساڵان بووم، ئەوکاتەی گەنجێکی کەم ئەزمون بووم، باوکم کچێکی دراوسێیانی بۆهێنام پاش دوساڵ کورێکم لێی بوو ناوم نا بێژەن و پاش ساڵێك هاوسەرەکەم بەهۆی نەخۆشیەکی دژوارەوە مرد.

پانزە ساڵی تەواو منداڵەکەم بەچاکی بەخێو کرد لەپاشان عاشقی ژنێك بووم لەراستیدا ئەوژنە خۆشی نەدەویستم تەنها چاوی بڕیبوە سەروەت و سامانم، پاشماوەیەك هێنام تەنها کوڕەکەمی لەدەست دەرکردم.

خێرا وتم ئێستا کوڕەکەت لەکوێ یە؟

وەڵامی دامەوە: دکتۆر هیچ هەواڵێکی نازانم ئەوشەوەی لەماڵ دەرم کرد هەوا زۆر سارد بوو لەپشت دەرگاکەدا هەڵدەچۆقی و هاواری دەکرد باوکە بانەمرم دەرگاکەم لیٚ بکەرەوە زۆرم خۆش دەوێیت، من لەوەڵامدا وتم:

برۆ هەرگیز نەتبینمەوە کاتێك گەڕامەوە ژورەکەم گوێم لەدەنگی بوو هاواری دەکرد باوکە رزگارم بکە بالەناو ئەم بەفرەدا نەمرم منیش لە ژورە گەرمەکەمدا چاوم بڕیبوە زۆپا گەرمەکە و هیچ ئاوڕێکم لیٚ نەدەدایەوە بەتەنها بیرم لە هاوسەرەکەم دەکردەوە ئێستاش سالآنێکە هیچهەواڵێکی نازانم بێگومان مردوە.

کوڕە تاقانەکەم بۆ ژنێك لەدەست دا، پاش ماوەیەك بەهۆی روداوی ئۆتۆمبیلەوە کوێر بووم کاتێك هاوسەرەکەم بەوشێوەیە منی بینی لێم جیابویەوە، پاش ماوەیەك بیستم لە هۆڵێکدا بوە بەراقیسە ئەمەش سەرگوزەشتەکەم بوو سەرگوزەشتی پیاوێك لەبەرخاتری ژنێك هەموو شتێکی لەکیس چوو.

لەوەڵامدا وتم: نیگەران مەبە بیر لەڕابردوو مەکەرەوە، پاشان هەر ئەوشەوە سواری ئۆتۆمبیلەکەم کردو راستەوخۆ کەوتینە ڕیٚ بۆ نەخۆشخانەکەی خۆم و لەویٚ خەواندم و تکام لەنێرگس کرد ئاگای لێی بێت، نێرگس کاتێك زانی باوکمە زۆر بەدڵسۆزیەوە خزمەتی دەکرد.

پاش هەفتەیەك بردمە ژوری نەشتەرگەری، چاوەکانی بەتەواوی کوێر بوبون بەڵام دەمارەکانی ئەعسابی بیٚ زیان بوون لەبەر ئەوەش ئەکرا چاوی مردویەکی لیٚ پەیوەند بکریٚ منیش لەوبوارەدا زۆر شارەزابووم.

دوباره ژیانم پیّ ببەخشیتەوە، من پەیکەریّکی سەرگەردانم و بەدوای رۆحی ون بومدا دەگەرێم. ئایا بەڕاستی دەتەوێت رۆح و دڵم پیّ بدەیتەوە؟ ئایا بەڕاستی دەتەوێت دەستم بگریت و لەم تاریکیە بەرەو دونیای روناکم بەریت؟! دکتۆر رزگارم بکە گەر رزگارم نەکەیت دەمرم لەکاتێکدا خوازیارم جارێکی تر خۆر و مانگ و ئەستێرەکان ببینمەوە، ئەم تاریکیە دەمکوژێت لەکاتێکدا شەو و رۆژ بەو ئومێدەوە دەژیم جارێکی تر روناکی ببینمەوە ئاسمانەکەی سەر سەرم ببینمەوە، کێوەکانی دەوروبەری شارەکەم ببینمەوە.

دکتۆر تەنها تۆ دەتوانی لەم تاریکیە رزگارم بکەیت گەرچی ناتبینم و نات ناسم و ناشزانم لەبەرچی هاتوی بۆ ئەم کەلاوەیە بەلاّم واهەستەکەم فریشتەبیت لەئاسمانەوە باریبیت بۆسەر زەوی و رزگارم بکەیت.

وتم پێم بڵیّ بزانم چۆن کوێر بویت؟

دەستەکانمی گوشی و وتی: هەموشتێکت بۆباس دەکەم لەبەر ئەوەیش راستیەکانت پیّ بڵێم دەبێت بگەرێمەوە بۆڕابردوو بۆئەوکاتەی بیست ساڵان بووم، ئەوکاتەی گەنجێکی کەم ئەزمون بووم، باوکم کچێکی دراوسێیانی بۆهێنام پاش دوساڵ کورێکم لێی بوو ناوم نا بێژەن و پاش ساڵێك هاوسەرەکەم بەهۆی نەخۆشیەکی دژوارەوە مرد.

پانزە ساڵی تەواو منداڵەکەم بەچاکی بەخێو کرد لەپاشان عاشقی ژنێك بووم لەڕاستیدا ئەوژنە خۆشی نەدەویستم تەنها چاوی بڕیبوە سەروەت و سامانم، پاشماوەیەك هێنام تەنها کورەکەمی لەدەست دەرکردم.

خێرا وتم ئێستا کورەکەت لەکویّ یە؟

وەڵامی دامەوە: دکتۆر هیچ هەواڵێکی نازانم ئەوشەوەی لەماڵ دەرم کرد هەوا زۆر سارد بوو لەپشت دەرگاکەدا هەڵدەچۆقی و هاواری دەکرد باوکە بانەمرم دەرگاکەم لێ بکەرەوە زۆرم خۆش دەوێیت، من لەوەڵامدا وتم:

برۆ هەرگیز نەتبینمەوە کاتێك گەڕامەوە ژورەکەم گوێم لەدەنگی بوو هاواری دەکرد باوکە رزگارم بکە باڵەناو ئەم بەفرەدا نەمرم منیش لە ژورە گەرمەکەمدا چاوم بڕیبوە زۆپا گەرمەکە و هیچ ئاوڕێکم لێ نەدەدایەوە بەتەنها بیرم لە هاوسەرەکەم دەکردەوە ئێستاش ساڵانێکە هیچهەواڵێکی نازانم بێگومان مردوە.

کوڕە تاقانەکەم بۆ ژنێك لەدەست دا، پاش ماوەیەك بەهۆی روداوی ئۆتۆمبیلەوە کوێر بووم کاتێك هاوسەرەکەم بەوشێوەیە منی بینی لێم جیابویەوە، پاش ماوەیەك بیستم لە هۆڵێکدا بوە بەراقیسە ئەمەش سەرگوزەشتەکەم بوو سەرگوزەشتی پیاوێك لەبەرخاتری ژنێك هەموو شتێکی لەکیس چوو.

لەوەڵامدا وتم: نیگەران مەبە بیر لەڕابردوو مەکەرەوە، پاشان هەر ئەوشەوە سواری ئۆتۆمبیلەکەم کردو راستەوخۆ کەوتینە ڕێ بۆ نەخۆشخانەکەی خۆم و لەوێ خەواندم و تکام لەنێرگس کرد ئاگای لێی بێت، نێرگس کاتێك زانی باوکمە زۆر بەدڵسۆزیەوە خزمەتی دەکرد.

پاش هەفتەیەك بردمە ژوری نەشتەرگەری، چاوەکانی بەتەواوی کوێر بوبون بەڵام دەمارەکانی ئەعسابی بێ زیان بوون لەبەر ئەوەش ئەکرا چاوی مردویەکی لێ پەیوەند بکرێ منیش لەوبوارەدا زۆر شارەزابووم.

کاتێك چوینە ژوری نەشتەرگەری باوکیشم وەکو نەخۆشەکانی تر جلوبەرگی سپی لەبەردابوو بەسەر قەرەوێڵەیەکەوە راکشابوو. چومە ژورسەری و لەسەر خۆ هەناسەی دەدا کاتێك دەستم خستە سەر دڵی دڵی بەپەلە لێی دەدا و بێدەنگ بوو هیچی نەدەگوت کاتێك لەژور سەریدا راوەستابووم رابردوم لەبیر خۆم دەبردەوە بۆئەوەی نەشتەرگەریەکی سەرکەوتوی بۆ ئەنجام بدەم بەلام کاتێك لەپەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەم دەکرد دیسانەوە ئەو رابردوە تاڵەم دەکەوتەوە بیر و لەدڵی خۆمدا دەم گووت:

باوکە تۆ هەمووشتێکت لێ زەوت کردم لەخۆشەویستی باوکایەتی بێ بەشت کردم، تەنها لەبەرئەوەی دڵی ژنێك خۆش بکەیت تەنها لەبەر ئەوەی لێت رازی بێت. دەرت کردم دەستە بچوك و لاوازەکانم بەتوندی گیر کردبوو لەکێلونی دەرگاکە بۆئەوەی دەرم نەکەیت بەلام تۆ زۆر دڵ رەقانە دەستمت هەڵبرچکاند و بەپاڵ دەرت کردم، بەلام ئەوەش بزانە هەموو هەوڵێکی من ئەوەیە تۆ بەئارەزوی خۆت بگەیەنم: گەرچی تۆ لەسۆز و خۆشەویتی باوکایەتی بێ بەشت کردم بەلام من هەرگیز کاری واناکەم.

ئەو رۆژە چاوێکی باوکم نەشتەرگەری کرد و لەپاش مانگێك چاوەکەی تریشم نەشتەرگەری کرد، کاتێك لەنەشتەرگەریەکە تەواو بووم چومە پاڵ سەریەوە و وتم:

نەشتەرگەریەکەت سەرکەوتوانە تەواو بوو، پاش ئەوەی چاوەکانتم کردەوە دەتوانیت هەموو دەوروبەرت بەباشی ببینیت گەر حەزیش بکەیت هەر لەم نەخۆشخانەیەدا ژورێکت پێدەدەم بۆئەوەی بەئاسودەیی تێیدا بحەسێیتەوە.

خێرا دەستی هێنایە پێشەوە و وتی:

دکتۆر هۆکاری ئەو هەموو خۆشەویستیەی تۆ نازانم چی یە، بەڵام تەنها ئارەزوویەکم ئەوەیە لەپێش بینینی هەموو شتێکەوە روخساری تۆ ببینم.

لەوەڵامدا هیچم نەوت و بێدەنگ بووم لەپاش مانگێک یەکێک لە پەرستارەکان لەفافەکەی سەرچاوی لێکردەوە و باوکم هەر لەو نەخۆشخانەیەدا مایەوە و ژوورێکم پێدا بۆخۆی بەڵام هەرگیز نەم هێشت باوکم روخسارم ببینێت هەمیشە بە پەرستارەکانی دەگوت:

حەزدەکەم ئەو دکتۆرە ببینم چاوەکانی بۆ نەشتەرگەری کردوم حەزدەکەم سوپاسی بکەم و دەستەکانی ماچ بکەم.

بەڵام من هەوڵم دەدا باوکم نەمناسێتەوە، چون ئەگەر بیناسیمایەتەوە لەوانەبوو نارەحەت ببوایە بڕۆیشتایە لەبەر ئەوەش بەنێرگسم ووت:

پێی بڵێن سەفەری کردوە باوکیشم هەموو رۆژێک بەنێرگسی دەوت:

کەی دکتۆر دەگەڕێتەوە نێرگسیش دەیگوت: نیگەران مەبە هەر رۆژێک دەبێت بگەڕێتەوە.

شەش مانگ تێپەڕی رۆژێکیان بەمەبەستی سەردانی نەخۆشەکان چومە ناو هۆڵی نەخۆشخانەکەوە لەناکاو چاوم بەباوکم کەوت لەباخچەکەدا لەپاڵ پەرستارێکەوە دانیشتبوو نەمزانی پەرستارەکە چی بەباوکم ووت بەرەو روم رایکردو کاتێک نزیک بویەوەلێم دەستی ماچ کردم وتی: جەنابی دکتۆر ماوەیەکی زۆر دەگەڕێم بەدواتدا بۆئەوەی سوپاست بکەم ئەمڕۆ ئەو پەرستارە تۆی پیشان دام و وتی ئەو

دکتۆرەبوو چاوەکانی بۆ نەشتەرگەری کردیت لەوکاتەدا سەری بەرز کردەوە و چەندساتێك بەسەرسامیەوە روانیە روخسارم.

نەمن قسەم کرد و نە ئەویش تەنها ئەودنەبێت لەبەر خۆیەوە دەیگوت باوەڕناکەم، نەخێر بەهەڵەداچووم.

پاشان لەناکاو بەدەنگی بەرز چەندجارێك هاواری کرد بێژەن: تۆیت، بێژەن تۆیت؟

بەپەلە وتم:

بەڵێ منم بێژەن کوڕی خۆت.

پاشان بەدەنگی بەرز دەستی کرد بەگریان و وتی جەنابی دکتۆر تۆ کوڕی من نیت منیش باوکی تۆ نیم لەبەر ئەوەی مافی ئەوەم نیە باوکی تۆبم جەنابی دکتۆر چۆن بەباوکی خۆتم دەزانیت، من کەسێکی خراپم و توانای ئەوەم نیە باوکی تۆبم.

وتم باوکەگیان خۆشم دەوێیت، ئێستاش بەباوکی خۆمت دەزانم چاك وایە هەر باسی رابردوو نەکەیت لەبەر ئەوە ئەبێت سەرلەنەخۆشەکان بدەم، بەپەلە جێم هێشت و راستەوخۆ رۆیشتم بۆ هۆڵی نەخۆشخانەکە.

لەپاش دوو رۆژ شەوێکیان باوکم بەشەرمێکەوە هات بۆلام.

وتم باوکە وەرە لەپاڵمەوە دانیشە.

هاواری کرد بەسە ئیتر پێم مەڵێ باوکە ئیتر نامەوێت ئەو وشەیە لەزمانی تۆوە ببیستم. تۆ مرۆڤێکی راستەقینەیت و من ئاژەڵێکی پیس و چڵکن هاتوم بۆئەوەی ئەمشەو خواحافیزیت لێ بکەم و بچم بەلای گەدایی خۆمەوە. من بۆماوەیەکی دورو درێژ ئارەزووم دەکرد

دەوروپشتم بینمەوە بەڵام ئێستا حەزدەکەم بگەڕێمەوە بۆ جیهانە تاریکەکەی خۆم.

لەوکاتەدا نێرگس هەستایە سەرپێ و دەستی باوکمی گرت و وتی:

بۆچی ئەوەندە خۆت ناڕەحەت دەکەیت ئەوەی بوە ڕۆیشتوە و ناگەڕێتەوە من چاك دەزانم جەنابی دکتۆر چەند سنگ فراوانە ئەو بەو سینگە فراوانەیەوە رابردوی فەرامۆش کردووە تۆش پێویستە رابردوو فەرامۆش بکەیت و لەلامان بمێنیتەوە.

بەڵام باوکم بەناڕەحەتیەوە دەیگوت:

تەریق دەبمەوە هەرگیز ناتوانم رابردوو فەرامۆش بکەم، ئەو بێویژدانی و خراپە کاریانەم ناتوانم فەرامۆش بکەم.

بەڵام نێرگس بەهەرشێوەیەك بوو دڵنەوایی دەدایەوە و دەیگووت:

پێویستە لەلامان بمێنیتەوەچون دکتۆر خۆشی دەوێت.

منیش توانای تەنها وشەیەکم نەبوو بیڵێم.

لەو رۆژە بەدواوە باوکم کەمتر لەژوورەکەی دەهاتە دەرەوە تەنانەت لە حەوشەکەشدا نەم دەبینی زۆربەی کات نێرگس دەچوە سەردانی بەڵام باوکم رۆژ لەدوای رۆژ ناڕەحەت تر دەبوو خەمبار تر دەبوو.

رۆژێکیان نزیکەی دەمەو نیوەڕۆ پێیان راگەیاندم ژنێکی هەژار زۆر نەخۆشە گەر فریای نەکەویت دەمرێت. بەپەلە خۆم گەیاندە ژنەکە. ژنێك بوو تەمەنی نزیکەی چل ساڵێك دەبوو بەبێهۆشی لەسەر قەرەوێڵەیەکدا کەوتبوو یەکەمجار وامدەزانی دەیناسم کاتێك بەباشی سەرنجی روخساریمدا مریەم بوو باوەڕم نەدەکرد رێکەوتێکی سەرسام بوو.

بەپەلە دەست بەکار بووم و هۆشی هاتەوە.

کاتێک چاوی کردەوە پرسی من لەکوێم؟ ئێرە کوێ یە؟

وەڵامم دایەوە ئێرە نەخۆشخانەیە، پاشان بەئارامی سەری بەلای مندا وەرچەرخاند چەند ساتێک سەیری روخساری کردم بەڵام نەیناسیمەوە.

پرسیارم کرد مەگەر لێرەدا کەست نیە؟

وتی نەخێر چون خەڵکی ئەم شارە نیم پێنج ساڵە لەم شارەدا زیندەگی دەکەم چەندساڵێک لەمەوبەر رەقاسەبووم لەبەر ئەوەی ئێستا پیر بووم دەریان کردووم ئێستاش جل و بەرگی ماڵانە دەشۆرم ماوەیەکیشە زۆر نەخۆشم دکتۆرەکانیش نازانن چیمە ناتوانم کاریش بکەم ئێستاش نازانم کاتێک لەنەخۆشخانە دەرم دەکەن بۆکوێ برۆم.

وتم نەخۆشیەکەت چاک دەبێتەوە بەڵێنت پێ دەدەم لەماوەیەکی کەمدا تەواو چاک دەبیتەوە کاتێکیش چاک بویتەوە لەم نەخۆشخانەیەدا دات دەمەزرێنم ئیتر پێویست ناکات شرو شیتاڵی ماڵان بشۆریت.

بەقسەکانم زۆر خۆشحاڵ بوو وتی جەنابی دکتۆر نازانم بەچ شێوازێک سوپاست بکەم دە ساڵە دەربەدەر و بەتبەختم، تا ئێستا هیچ کەس یارمەتی نەداوم ئەوە یەکەمین جارە دەبینم پیاوێک یارمەتیم بدات بێ ئەوەی چاوەڕوانی شتێکم لێ بکات بەڕاستی پلەی مرۆڤایەتیت بێ هاوتایە تائێستا پیاوێکی وەک تۆ پاکم نەبینیوە.

کاتێک باوەژنەکەم ئەم قسانەی دەکرد خستمیەوە ناو بیری ئەو قسە ناڕەوایانەی چەند ساڵێک لەوەوپێش پێی دەگوتم کاتێک تەمەنم لە پانزە ساڵ زیاتر نەبوو بەباوکمی دەگووت بێژەن هەتیوێکی سەرسەری و بەد رەوشتە، ئێستا لەپاش چەند ساڵێک دەڵێت تائێستا پیاوێکی ئەوەندە پاکم نەبینیوە. سەرەنجام هەموو مرۆڤێک دان بەڕاستیدا دەنێت بەڵام چ

کاتێك ئەوکاتەی لەهەموو لایەکەوە نائومێد دەبێت و بێ چارە و بێ دەسەلات دەبێت.

پاش ئەوەی باوەژنەکەم تەواو چاك بویەوە لە نەخۆشخانەکەدا دام مەزراند شەوانیش هەر لەوێ دەمایەوە و ڕۆژانیش بەناونیشانی پەرستار کاری دەکرد بەلام لەبەر ئەوەی زۆر لاواز بوبو بڕیارم دەرکرد کاری سەختی پێ نەکەن هەر چۆن خۆی حەزدەکات باوا کاربکات.

یەك مانگ تێ پەڕی ئەو مالە بچوکەی بۆمن و نێرگس دروست دەکرا تەواو بوبو تەنها رەنگ کاری مابوو ئەویش بەچەند ڕۆژێك تەواو دەبوو زۆر خۆشحالْ بووم لەبەر ئەوەی بەتەواو بوونی مالەکە من و نێرگس زەماوەن دەکەین.

ڕۆژێکیان دەمەو ئێوارە بۆ سەردانی نەخۆشێك چوبوم لەناکاو نێرگس هات بۆلام و وتی یەکێك لە پەرستارەکان خۆی کوشتوە.

خێرا وتم لەکوێ یە؟

وەلامی دایەوە لەژورەکەی باوکتایە.

بەپەلە لەگەلْ نێرگس چوینە ژورەکەی باوکم باوەژنەکەم بینی لەسەر زەویەکەدا کەوتبوو. دەینالاند باوکیشم لەژور سەریدا دانیشتبوو.

خێرا پشکنینم بۆکرد، سەرنجمدا بە زەهرێکی دژوار خۆکوژیی کردوە و دواساتەکانی زیندەگی بەسەر دەبات.

کاتێك باوەژنەکەم چاوی پێم کەوت بەناڕەحەتیەکەوەهەستایە سەرپێ و بەگریانەوەوتی:

جەنابی دکتۆر وەرە پێشەوە با دەستەکانت ماچ بکەم گەرچی لەوەش کەمترم تەنانەت ناویشت بهێنم بەلام لەبەر ئەوەی کە ئەزانم مرۆڤێکی سنگ فراوانی داوای لێبوردن دەکەم دان بەتاوانەکانی خۆمدا

رەنێم دەزانم ژنێکی بەد رەوشت وبێویژدانم تانەوجێگەیەی توانیم بەدناوم کردیت.

وتم: مریەم خان هەرچی بو رۆیشت پێم وایە کارێکی چاکت نەکردوە چون خۆکوژی کارێکی ژیرانە نیە،من بەتەواوی رابردوم فەرامۆش کردووە تەنانەت زۆریشم خۆش دەوێیت، بۆچی خۆکوژیت کردووە: لەژیاندا گەر مرۆڤ دوچاری هەڵەیەك ببێت نابێت بەهەڵە هەڵەکەی قەرەبوو بکاتەوە.

لەوکاتەدا وەڵامی دایەوە جەنابی دکتۆر بونی نەنگینی من شیاوی ژیان نیە من گوناهکارم پێویستە بمرم پێم باش نیە پیسێکی وەکو من لەژیاندا بمێنێتەوە، نەنگی مرۆڤایەتیم پێویستە بمرم، رابردووی تاریکم هەرگیز لەبیرناچێتەوە هەموو کەسێك دەبێت سزای کارە ناڕەواکانی هەر لەم دونیایەدا ببینێت، من پاش ئەوەی تۆم لەماڵەکەدا دەرکرد لەوڕۆژە هەتا ئێستا هەموو تەمەنم ئازار و ئەشکەنجەیە لەکاتێکدا وام دەزانی دەرت بکەم ژیانم ئاسودە دبێت.

جەنابی دکتۆر گەرچی هەموو تاوانەکان لە ئەستۆی مندایە بەڵام ئەوەش بزانە باوکیشت تاوان بارە لەبەر ئەوەی من لەوکاتەدا کچێکی هەڵەو ئەرزەبووم شوێن ئارەزوەکانی خۆم دەکەوتم چاکی و خراپیم بەباشی بۆ دەست نیشان نەدەکرا، خۆ باوکت پیاوێك بوو خاوەن ئەزموون نەدەبوا بەئارەزووی من بجوڵایایەتەوە ئەگەر ئەو باوکێکی بەسۆزبوایە نەدەبوا قسەی من کاری تێبکردایە و کوڕە تاقانەکەی لەبەر خاتری من دەربکردایە، کوێرانە گوێڕایەڵی منی دەکرد من ئافرەتێکی نامۆبووم بەئێوە، ئەی خۆ باوکت پانزەساڵی تەواو لەگەڵ تۆدا دەژیا خوێنتان تێکەڵاوی یەك بوو کوڕە تاقانەکەی بوویت نەدەبوا ئەویش

هەمان رەفتاری منی بکردایە کەواتە بزانە هەردوکمان تاوانبارین بەڵام باوکت زۆرتر تاوان بارە، من باوەڕم زۆر جیاوازین خۆ ئەو باوکت بوو ئەبوایە کوڕەکەی خۆش بویستایە گەر خراپەیەکم دەرحەقت بکردایە ئەبوا ئامۆژگاری بکردمایە ئەگینا بۆجارێکی تر نەمدەتوانی رەفتاری ناشیرین بەرامبەرت بکەم، چارەنوسمان وای لێ نەدەهات، لەڕۆژی یەکەمدا هەرچیەکم دەوت بەگوێی دەکردم، لەگەڵ خۆیدا دەیبردم بۆ شوێنی خراپەکاری هەتا نیوەی شەو لەگەڵ پیاوی ئارەزوو پەرست خەریکی قومار دەبوین گوێچکەکانم بەقسەی ناشیرین ئاخنرابون چاوەکانم بەشوێنی خراپەکاریەوەبوون لەوکاتانەشدا زۆر گەنج بووم ئەبوایە لەشوێنێکی سالمدا پارێزگاری لێ بکردمایە بەپێچەوانەوە دەیبردم بۆ کۆڕی گورگە برسیەکانی نێو کۆمەڵگا کەم کەم لەنەریتی کۆمەڵایەتی لامدا تائەودەمەی بەژنێکی بەت رەوشت بانگیان دەکردم، تاوان باری سەرەکی باوکتە نەدەبوا بیبردمایە بۆناو کۆڕی خراپەکاری چارەنوسم وای لێنەدەهات.

بکوژی سەرەکی من باوکتە هۆکاری بەدناوی و خراپەکاریەکانم هەر ئەوە، هەرئەوە کە لەگەڵ پیاوێکی نەناسدا رۆژم دەکردەوە، خەڵکیش ئەم بابەتەیان چاك دەزانی تەنها کەسێك کە ئەم بابەتەی نەدەزانی باوکت بوو گەر کەسێك پێی بوتایە ژنەکەت شەوانە لەگەڵ خەڵکدا رادەبوێرێت هەرگیز باوەڕی نەدەکرد و نرخی بۆ قسەی خەڵکی دانەدەنا، ئایا بەوڕادەیەش دەبێت باوەڕ بەژن بکەیت؟

کامەرانی تۆی لەناو برد منی دەدا بەدەست خەڵکیەوە دکتۆر باوەڕبکە باوکت تاوانبارترە.

بەوشێوەیە قسەی دەکرد کەم کەم قسەکانی هێواشتر دەبوو تا چاوەکانی نابەیەکدا و بەیەکجاری بێدەنگ بوو.

لەوکاتەدا روم کردە باوکم و وتم باوکە خۆ ئەو نەیناسیمەوە بۆچی راستیەکانت پێ وت؟

باوکم بەگریانەوە وەڵامی دامەوە: چەند رۆژێک لەمەوبەر لەباخچەکەدا منی بینی زۆر سەرسام بوو لەبەر ئەوەی رەنگ و روخسارم گۆڕابوو، پرسیاری لێکردم: چۆن چاوەکانت چاک بویەوە؟ منیش ناچار بووم هەموشتێکی بۆبگێڕمەوە ئەویش خۆکوژی کرد ئەم هەلومەرجەش والەمن دەکات خۆم بکوژم یان مۆڵەتم بدەرێ بڕۆم لێرەدا ئازاری ویژدان نارەحەتم دەکات.

وتم باشە باوکەگیانماڵەکەی خۆمانت بۆدەکڕمەوە بۆئەوەی پاشماوەی تەمەنت لەوێدا بەکامەرانی بەسەربەریت.

باوکیشم بەخۆشحاڵیەوە وتی ئەگەر ئەم کارە بکەیت بێ پایان سوپاست دەکەم.

ئەورۆژە لەگەڵ باوکمدا گەڕاینەوە بۆ شارەکەی خۆمان ماڵەکەی خۆمان کە باوکم لەبەر هەژاری فرۆشیبوی کڕیمەوە و خاوەنەکەی پاش چەند ڕۆژێك چۆڵی کرد و باوکم رۆیشتەوە ناوماڵەکەی خۆی و منیش لەناکاو کەوتمەوە بیری محمد و دایکی یەکسەر بەرەو کەلاوەکەیان کەوتمە رێ کاتێک گەیشتمە ئەوێ سەرنج دەدەم پیرەژنێکی پشت چەماوە لەبەردەم کەلاوەکەدا دانیشتوە، چومە پێشەوە کاتێک سەرنجمدا پیرەژنەکە دایکی محمدە. سڵاوم کرد و پاشان چومە ناو کەلاوەکەوە دایکی محمدیش بەدوامدا هاتە ژورەوە زۆر پیر بوبو

چاوەکانی تەواو کز بوبو کەلاوەکەشیان بچوکترین گۆڕانکاری نەکردبوو هەروەکوخۆی مابویەوە.

دایکی محمد بەئارامیەکەوە وتی تۆکێیت؟

وەڵامم دایەوە بێژەنم.

چەندساتێك کەوتە بیرکردنەوە و وتی ببورە ناتناسم.

لەوەڵامدا وتم ئایا بیرت ناکەوێتەوە چەندسالێك لەمەوبەر لەشەوێکی ساردی زستاندا جێگای کوڕێکت کردەوە کەناوی بێژەن بوو؟

لەوکاتەدا پیرەژن ماوەیەکی زۆر سەیری روخساری کردم و پاشان وتی خوای گەورە تۆ هەمان بێژەنیت؟

خێرا وەڵامم دایەوە بەڵێ باشت ناسیمەوە هەمان بێژەنم ئێستا پێم بڵێ محمد چۆنە و لەکوێ یە؟

لەوەڵامدا هەناسەیەکی هەڵکێشا و وتی پرسیاری محمد دەکەیت محمد پیاوێکی نەخۆش و گرفتارە کاتێك رۆیشتی محمد نەیتوانی کارێك بۆخۆی بدۆزێتەوە لەبەر ئەوەش ناچار بوو حەماڵی بکات لەبەر کارە قورسەکەی هەمیشە نەخۆشە.

لەوکاتەدا لەناکاو محمد هاتە ژورەوە و خێرا هاتە پێشەوە و ماچم کرد و وتم محمد گیان من بێژەنم هەمان ئەوکەسەی جێگەتان کردمەوە.

بێژەن لەکاتێکدا چەند کاغەزێکی نەخۆشخانەی بەدەستەوەبوو وتی: بێژەن گیان خۆزگەم بەخۆت منی بێچارە دوارۆژەکانی تەمەنم بەسەر دەبەم.

خێرا وەڵامم دایەوە محمدی ئازیز پێویستە لەگەڵم بێیت دەبێت پێکەوە ژیان بەسەربەرین زۆر نیگەران مەبە چون نەخۆشیەکەت

چارەسەر دەکرێت دەتبەم بۆ نەخۆشخانەیەك زۆربەباشی چاکت دەکەنەوە، دایکی محمد لەژێر لێوەوە دەیگوت ئینشائەڵا.

بەڵام محمد لەوەڵامدا وتی ئەگەر تەمەنم مابێت.

خێرا وتم محمد گیان لەهەموی گرنگتر ئەوەیە ژن ئەهێنم پێویستە لەئاهەنگەکەدا ئامادەبیت دەمەوێت بەبرای خۆمت بناسێنم بەخەڵکی.

محمد بەپەلە هاتە پێشەوە و لەباوەشی گرتم و لەخۆشیا فرمێسکی شادی دەڕشت لەوکاتەدا وتی بێژەن تەریق نابیتەوە لەخەڵکی بەبرای خۆتم دادەنێیت؟

وتم: نەخێر محمد گیان بەپێ

بەپێچەوانەوە بەوپەڕی سەربەرزیەوە دەڵێم تۆ برامیت لەبەر ئەوەی کەسایەتی تۆ و دایکت لەهەمو کەس بەنرخترە لەلام.

کاتێك ڕۆمانی ( بێ سەرپەرشتان ) دەخوێننەوە ئاشنا دەبن بە پاڵەوانی چیرۆکەکە دەبینن بیژەن نەك هەر کەسێکی تاوانبار نیە بەڵکو لە دڵەوە زۆر هەوڵی دەدا ببێتە کەسێك بتوانێت خزمەتی کۆمەڵەکەی بکات ، ئەمە جگە لەبەسەربردنی تەمەن و ڕاکردن لەدەست زوڵم و زۆری باوەژن . ڕێکەوت وایکرد بیژەن ببێتە کوڕێکی تاوانبار و سزای تاوانێك بدات کە بەهیچ جۆرێك ئارەزووی کردنی نەبوو.

ڕەوڕەوەی ژیانی بیژەن ئەوە دەسەلمێنێت مرۆڤ چەند لەناو سەختی و ئازارەکانی ژیاندا بژی و بەرەو ڕوی ناهەموارییەکانی ببێتەوە گەر مرۆڤێکی کۆڵنەدەر و خاوەن ئیرادەیەکی پۆڵاین بێت لەگەڵ ئەو هەموو ئازارەشدا ئەتوانێت ململانێ بکات و بگاتە ئامانجی خۆی ......

دیزاین فەرهاد

نرخی سێ هەزار دینارە



لە بڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا